تاریق ئۆسلو







منتدى إقرأ الثقافي
www.iqraahlamontada.com

# دایــکەکان



چەندین ڕاستی سەرسوڕهێنەر دەربارەی دایك کە تا ئێستا لە کتێبی زیندەوەرزانی و کتێبە زانستییەکانی دیکەدا باس نەکراوە.
















# دایکەکان



چەندەها ڕاستیی سەیروسەمەرە دەربارەی دایکان،
کەلە کتێبەکانی زانستی ژیان و زانستەکاندا بەدی ناکەین!



# دایکەکان

نووسینی: تارق ئوسلو

نیگارکێش: ئیبراهیم چیفتچی

وەرگێڕانی: هێمن عوسمان

پێداچوونەوەی: شیرین کریم

نۆرەی چاپ: یەکەم ٢٠٢٣

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان،
ژمارەسپاردنی (٢٠٥٠)ی ساڵی (٢٠٢٢)ی پێ دراوە.



**ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا**
**ARA MEDIA CENTER**

+964 (0) 770 938 3000 | +964 (0) 750 938 3000
www.aramediacenter.com    info@aramediacenter.com

بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوی بەرهەمەکان: سلێمانی، شەقامی سەرەکی ئیسکان، نزیک کەمپی ناوشاری زانکۆی سلێمانی



© بەپێی ڕێککەوتنی فەرمیی نێوان ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا و دەزگای بەرهەمهێن، ناوەندەکە دەبێتە خاوەنی مافی چاپی کوردیی ئەم بەرهەمە. ڕێگە نادرێت بە لەچاپدانەوە و کۆپیکردن، یاخود دابەزاندنی لە سایت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، یاخود بەکارهێنانی وێنەکان بۆ بەرهەمی دیکە. سەرپێچیکاریش ڕووبەڕووی سزای یاسایی دەبێتەوە.

# پێشەکی



خانمان و پیاوانی بەڕێز؛ جارێکی دیکە سڵاو!

ئەوانەی دەترسن لەوەی بڵـێم: "گەیشـتینە کۆتـایی گەشـتی **زنجیرەی بەدیهێنراوە سەرسوڕهێنەرەکان**، کە لە سـاڵی ٢٠٠٧دا بە کتێبی گیاندارە سەرسـوڕهێنەرەکان دەسـتمان پـێ کـرد!"، ئـا لێرەدا دەتـوانن هەناسـەیەکی قـووڵ هەڵبمـژن و بەئاسـوودەیی بڵێن: "ئۆخەی هێشتا ماویەتی!"

ئەم کتێبەی گەشتەکەمان کۆتایی زنجیرەکە نییە، بەڵکـو تەنیـا دواییینیانە! ئەگەر نووسین لە چارەنووسی منـدا و خوێنـدنەوە لە چارەنووســـی ئێـــوەدا بێـــت، ئەوا لە دەوری کتێبـــی زیـــاتری بەدیهێـــنراوە سەرســـوڕهێنەرەکاندا کـــۆ دەبیـــنەوە و ئەزمـــوونی ڕووداوگەلێکی خۆش و پڕ زانیاریی و دانایی دەکەین.

ئەم کتێبەمان کەمێک لە کتێبەکـانی دیـکە جیـاوازە، چـونکە بابەتەکە دایکانە!

کاتێک لەملا و ئەولا، لە هەژمارەکـانی تـۆڕی کۆمەڵایەتیـدا بڵاوم کردەوە و وتم: "بۆ ئاگاداری، دوایی مەڵێن نەمانبیسـتووە، ئەوە کتێبی **'دایکەکـان'** دەنووسـم! نـازانم بـۆچی دایکـان بەمە تووشی دڵەڕاوکێ بوون؟

وا بزانم پێیان وایە تارق ئوسلو بێبەزەییانە گاڵتەیان پێ دەکات.

بەڵام هەر دایکان نەبوون کە بەو شێوەیە بیریان دەکردەوە، بەڵکو خوێنەرە ئازیزەکانیشم کە ئەم هەواڵەیان بیست، بیرۆکەی نووسینەکەیان زۆر بەلاوە گاڵتەئامێز بوو، تەنانەت لە پێشانگاکاندا هەندێك لە خوێنەرەکانم دەبینی، سەیری دایکیان دەکرد و دەیانوت: "ئای! خودا دەزانێت چ شتێکی سەرسوڕهێنەرتان لەسەر دەنووسێت، هەمووی یەک بە یەک ئاشکرا دەکات و دەیاننووسێت!" دایکان لە دڵەڕاوکێدا بوون، منداڵانیش کەیفخۆش بوون.

منیش تەنیا سەرم سوڕمابوو!

تەنانەت ئەگەر هەمووان دڵنیابن لەوەی کتێبێکی خۆش دەبێت، تازە ئەو دڵەڕاوکێیەی دایکان کاریگەریی لەسەر منیش دروست کرد و کەمێک تووشی دڵەڕاوکێ بووم. چونکە تاکە هۆکارێک کە پاڵی پێوە نام لە بارەی دایکان بنووسم، لە کاتێکدا لە لیستی ئەو بەدیهێنراوە سەرسوڕهێنەرانەدا نەبوو کە دەمنووسین؛ ڕاکێشانی سەرنجەکان بوو بۆ یەکێک لە گەورەترین موعجیزەکان کە لە ژێر ئەستێرەکاندا ڕوو دەدات.

قسە لەسەر چەند نموونەیەکی دایکایەتی ناوازە لەسەر ڕووی زەوی دەکەین، بۆ پەیبردن بەوەی دڵی دایک چۆن

ئاوێنەی میهرەبانیی و بەزەییە، جا سەر بە هەر بوونەوەرێک بێت، جیاوازیی نییە.

بەدڵنیاییەوە وەک هەمیشە کاتێک باسی بابەتە جددییەکان دەکەم، بیرۆکەیەکی باشە کەمێکیش پێبکەنین. خەمبار مەبن، چونکە کتێبی 'دایکەکان' کتێبێک نییە بەدەم گریانەوە بیخوێننەوە، بەڵکو پێدەکەنن و کاتێکی خۆش بەسەر دەبەن. دڵنیام لەوەی ئەو دایکەشتان کە هەر خەمێتی و دەڵێت: "ئاخۆ چۆن باسی کردووم؟"، ئەویش دەیەوێت بیخوێنێتەوە، کاتێکی زۆر خۆش بەسەر دەبات. بەڵام لە کۆتایی دا لە شوێنێکی ئەم کتێبەدا شتێك هەیە کزە لە جەرگتەوە بێنێت ئیتر بۆ دایکەکە بێت یان کۆرپەکە.

لەم نێوەندەشدا، با باوکانی وەک منیش خەمبار نەبن و بڵێن: "ئەوە کتێبی دایکەکان هەیە، ئەی باوکەکان چی؟"، ئەویشم خستووەتە لیستەکەوە. پلانیشم وایە پێشەکییەکی سەرنجڕاکێشی بۆ بنووسم!

**تارق ئوسلو**

## پێغەمبەری ئازیزمان (د.خ) دەفەرموێت:

"خودای گەورە ڕەحمەت و میهرەبانیی کردووە بە سەد بەشەوە. نەوەد و نۆ بەشیانی لای خۆی بۆ ڕۆژی دوایی هێشتووەتەوە. تەنیا یەک بەشیانی ناردووەتە خوارەوە بۆ سەر زەوی. ئیتر ئەمەی کە دەیبینن بەدیهێنراوەکان لەناوخۆیاندا ڕەحم بەیەکتر دەکەن و بەزەییان بەیەکتردا دێتەوە، ئەمە هەمووی بەشێکە لەو تاقە بەشە، تەنانەت ئەوەش کە وڵاخ سمی خۆی دەپارێزێت نەبادا بەر بەچکەکەی بکەوێت، ئەویش لەو بەشەیە.[1]"



١ - ریاض الصالحین، نووری فارس، بەرگی ٢، لا ١٠. بوخاری: ٦٠٠٠.

# دەنگی توورەکەی کەنگەر
# لە مێرگەوە دێت



کاپتن جەیمس کوک، وەک هەموو داگیرکەرانی دیکەی ئەورووپی، لە بەرگی ئەو کەسانەی لە هەوڵی گەڕان و دۆزینەوەی شوێنی نوێدا بوون، لە یەکێک لە گەشتەکانیدا بۆ دۆزینەوەی وڵاتێک بۆ ئەوەی تالانی بکات، خۆی لە کەناراوەکانی باشووری ئوسترالیادا بینییەوە.

هەرچەندە پێشتر ئوسترالیا لەلایەن کەشتیوانانی هۆڵەندییەوە دۆزرابووەوە، بەڵام هێشتا بۆ ئامانج و مەبەستی خۆیان بەکار نەهێنرابوو.

کاتێک کاپتن کوک گەیشتە وشکانی، ئاهێکی هەڵکێشا و وتی: "دەبێ چەند خەڵکی ڕەسەن لێرە هەبن بۆ ئەوەی لەناوببرێن و تۆویان نەمێنێت!"

ڕاستییەکەی، گەشتێکی لەو شێوەیە بە تواناکانی ئەو سەردەمە، کارێک بوو بوێریی زۆری دەویست.

کوک پیاوێکی ئازا و چاونەترس بوو، هەر لە منداڵییەوە سەرقاڵی دەریاوانی بوو، لەبەر ئەوە دەریاوانێکی زۆر لێهاتووی لێ دەرچووبوو. کاتێک شەوان لە کابینەکەیدا دەخەوت،

خەونی بە کەشتیی بارهەڵگری ئێندیاڤۆرەوە دەبینی کە وا پڕی دەکرد لە ئاڵتوونی درەوشاوە، لە ڕاستیشدا کەشتییەکی گواستنەوەی خەڵووز بوو.

لە مانگەکانی نیسانی ساڵی ١٧٧٠دا، کەشتیی ئێندیاڤۆر لە کەناراوەکانی کیشوەرەکە لەنگەری گرت، بەڵام لەبەر ئەوەی لە ١٦ی حوزەیراندا لە کەناراوەکانی باشووری خۆرهەڵاتی ناوچەکە بەر زەوی کەوتبوو، زیانی بەرکەوتبوو، هەر بۆیە کەشتییەکە برابووە کەنارەکە بۆ ئەوەی نۆژەن بکرێتەوە.

لە دووریی چەند کیلۆمەترێک لە کەنارەکەوە، یۆوی قەڵەو، کە یەکێک بوو لە خەڵکە ڕەسەنەکانی ئوستراليا، لە بەرزاییەکەوە کە بەسەر کەنارەکەدا دەیڕوانی، لەژێر سێبەری درەختێکدا ڕاکشابوو، سەری بەرز کردەوە و تەماشایەکی خوارەوەی کرد. کاتێک کەشتیی ئێندیاڤۆری بینی، خێرا هۆڵەندییەکانی بە بیردا هات کە پێشتر بینیبوونی و هیچ خۆشیی لێیان نەدەهات، ئینجا وتی: "ئەو ڕەزا قورسانە، دووبارە هاتنەوە!"

هاوسەرەکەی یۆوی قەڵەو، ئەم قسانەی هاوسەرەکەی پێ خۆش نەبوو. لە جێگاکەی سیخورمەیەکی لێدا و وتی: "وا مەڵێ، هەڵسە، بڕۆ بەخێرهاتنیان بکە! پێیان بڵێ پێویستان بە چییە؟ بپرسە، ئاخۆ برسین یان تێرن؟!"

یۆوی قەڵەو، لەناو ئەو خۆڵەی وەک سەرین سەری لەسەر دانابوو، کەمێک بە دەستەکانی گەڕا و مێروولەیەکی هەنگوینی گەورەی دۆزییەوە و خستییە نێوان لێوە ئەستوورەکەیەوە و بە دەم ئاخهەڵکێشانەوە هەستایە سەر پێ و بەرەو ئەو کەناراوە چوو کە کەشتیی ئێندیاڤۆر لەنگەری تێدا گرتبوو.

لە لایەک ڕێی دەکرد و لە لایەکی دیکەشەوە ئەم گۆرانییەی دەوتەوە -لەبەر خاتری ئێوە گۆرانییەکەم لە زمانی خەڵکی ڕەسەنی ئوسترالیاوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی- بۆیە پێویستبوو سەرەتا جوان فێری ئەو زمانە ببم، ئەگەر دەپرسن: بۆچی ئەم کتێبە وا درەنگ کەوت؟ ئەمە هۆکارەکەیەتی، گۆرانییەکەشی ئەمە بوو:



دەنگ دێ، دەنگی پێ دێ
خێر بێ، خوایە خێر بێ
بەچکەی کەنگەر، بازدە بۆ دەر
کەشتییە بەدفەڕ، هاتە لەنگەر
لۆی لۆی دەلۆی لۆی!
سەرزلی کافر، نە یەکن نە دوو
دەیانناسمەوە بێچاون، بێڕوو
ژنێ تۆ لادە ئەو سفرە و خوانە
من و تۆ پاکین دزن ئەمانە

لۆی لۆی دەلۆی لۆی!

لۆی لۆی دەلۆی لۆۆۆۆی!

لە کاتێکـــدا یـــۆوی قەڵەو بەدەم یـــاریکردن بەو مێـــرووولە هەنگوینییەی خستبوویە نێـوان لێوەکـانی و بەدەم گۆرانیـوتنەوە ڕێــی دەکــرد، ڕەوێکــی کەنــگەر بە هەڵــبەزودابەزەوە بەلایــدا تێپەڕین.

کاتێـک یـۆوی قەڵەو گەیشـتە کەنـاراوەکە، کـاپتن کـوک و تیمەکەی دەمێک بـوو بەو بەلەمە ڕزگارییـانەی بە کەشـتییەکەوە بەردرابوونەوە، خۆیان گەیاندبووە وشکانی.

ئەمە بۆ کـاپتن کـوک هەنگـاوێکی بچـووک بـوو، بەڵام بـۆ نەتەوەی ڕەسەنی ئوسترالیا هەنگاوێکی گەورە بـوو، چـونکە لە پـــاش مـــاوەیەکی کـــورت، یەکێکـــی دیـــکە لە گەورەتـــرین کۆمەڵکوژییەکـــانی مێـــژووی مرۆڤـــایەتی ڕوو دەدات و ئەو خەڵکە ڕەسەنە بێچارەیە کە کەسانی بە قەناعەت و دڵ باشن، لە ژێر ئەم جێپێیانەدا دەپلیشێنەوە.

لەو کـاتەدا، کۆمەڵێـک ئـاژەڵی سـەیری گەورە کەوتـنە بەر چـــاوی کـــوک کە پێشـــتر نەیبینیبـــوون و لە نێـــو دەوەن و درەختەکانـدا لەپـڕ دەردەکەوتـن و دیـار نەدەمـان، بەڵام یـۆوی قەڵەو کە خەریک بوو لێیان نزیـک دەبـووەوە، زیـاتر سـەرنجی ڕاکێشان.

- چـۆنە؟ باشـە، وا نیـیە؟ جەسـتەیەکی پـتەوی هەیە! لەمـانە کۆیلەی باشیان لێ دەردەچێت!

- نازانم کاپتن! وایشمان بە هیندییە سوورەکان وت، بەڵام خـۆ دەزانیت وانەبوو.

- ئەگەر نەبێت، لەناویان دەبەین!



دوای سڵاوکردنێکی نابەدڵی، کوک سەبارەت بەو ئـاژەڵانەی نێوان درەختەکان لە یۆوی قەڵەوی پرسی.

لە ڕاسـتیدا ئەوەی ئەم حەزی دەکـرد بیزانێـت ئەوە بـوو کە گۆشتی ئەم ئاژەڵانە، خۆشە یان نا، گەدە تێکدەدەن یان نا؟

دوایـین شـت کە کـوک لە دووریـی نیشـتمان دەیوسـت تێکچوونی گەدە و سکچوون بـوو، کە بە خـواردنی ئەو ئـاژەڵە

تووشیان دەبوو. کـوک بە دەسـتێکی ئامـاژەی بە هەڵـبەزودابەز کرد و وتی:

" What is this? Boing! Boing! Boing! What is this? Ha?"

کـووک، وەک هەمـوو ئینگلیـزە خۆبەزلزانەکـان کە خۆیـان بەژێر دادەنێن، پێـی وابـوو هەمـوو کەسـێک زمـانی ئینگلیـزی دەزانێت، ئەوانەشی نایزانن، پێویستە هەرچی زووە خۆیـان فێـر بکەن.

یـــــۆوی قەڵەو، دوای ئەوەی پاشـــــماوەی مێـــــرووله هەنگوینییەکەی دەمـی ڕووەو پێڵاوەکـانی کـوک تـف کـردەوە، وەڵامی دایەوە و وتی:

- کان گو ڕووو؟
- کانگورو؟
- کان گو ڕووو؟
- هاهاها! کانگورووو! کانگورو! کانگورو!

کاپتن کوک ڕووی بۆ لای پیاوەکانی وەرگێڕا و وتـی: "سـێ چوار دانە لەو کەنگەرانە بگرن، بـا خێـرا دەسـت بە خواردنیـان بکەین. ئێـرە کیشـوەرێکی گەورەیە، چەنـدە خێـرا دەسـت پـێ بکەین، ئەوەندە زۆرتر دەخۆین!"

پیاوەکـانی کـوک، بەهەڵـپە شـوێن کەنگەرەکـان کەوتـن، ئەو کەنگەرانەی تەنانەت سەگە دینگۆکانیشی[1] دەترسـاند، گرتنیـان ئەوەنـــدەش ئاســـان نەبـــوو، ئەم گیانـــدارە لە توانایـــدایە لە کاتژمێرێکدا هەشت بۆ دە کیلۆمەتر بە هەڵبەزودابەز ڕابکات.

بەڵـــێ گرتنیـــان ئاســـان نەبـــوو، بەڵام کـــێ توانیـــوێتی لە دەسـت پیـاوە سـپی پێسـتەکە ڕزگـاری بێـت، تـا کەنگەرەکـان ڕزگاریان ببێت؟

ڕاکردنـــی پیاوەکـــانی کـــوک بە دوای کەنگەرەکانـــدا بە دەم وتـــنەوەی: "کانگورو!کـانگورو!" هەم یـــۆوی قەڵەویـــان ترساند، هەمیش خستیانە پێکەنین.

ترسا، چونکە ئەو پیاوانە لە دڕندەترین نەتەوە کە تـا ئەو ڕۆژە بینیبوونی، دڕندەتر بوون.

پێکەنـــی، چـــونکە "کـــان گـــو رو" لە زمـــانی ڕەســـەنی خەڵکـــی نـــاوچەکەدا نـــاوی ئەو ئـــاژەڵە گەورەیە نەبـــوو کە بە هەڵبەزودابەز ڕایدەکرد.

بەڵکو بە واتای: "کوڕم، ئەوە چی دەڵێیت، تێناگەم؟" دێت!

ڕووداوەکە بەو شـێوەیە بـوو. لەو کـاتەوە کەس نەیتوانیـوە ناوی کەنگەر بگۆڕێت و بڵێت: "ڕاوەسـتن! هەڵە تێگەیشـتنێک بوو! ئەوە بەهۆی گەمژەیی کاپتنەکەمانەوە سەری هەڵداوە!"

---

١- دینگۆ: جۆرە سەگێکی ئوسترالییە.

ئیدی هەموو جیهان ئەم بەدیهێنراوە خۆشەویستە بە کەنگەر ناو دەبەن.

ڕەنگە ئینگلیزە داگیرکەرەکان ئەگەر بە درۆش بێت جار جار داوای لێبووردن لە خەڵکە ڕەسەنەکەی ئوسترالیا بکەن، کە ڕەچەڵەکیان لەناو بردوون، بەڵام ئەویش دوای کاتژمێرێک بە کەڵکی هیچ نایەت.

ستەملێکراو هەر بە ستەملێکراوی مایەوە و ستەمکاریش هێشتا درندەترە و بەردەوامە لە گەڕان بەدوای هەژارێکدا بۆ ئەوەی بەو تەنیا ددانەی لە دەمیدا ماوە، وەک جادووگەری نێو داستانەکان کە خۆی پێ شاژنە، بگەزێت.

بەڵام لەو ڕۆژەی مافی بزنی بێ شاخ لە بزنی شاخدار وەردەگیرێتەوە، بێگومان لێپرسینەوەیش لەو دێو و درنجە تاک ددانە دەکرێت، لە پای ئەو کارانەی ئەنجامی داون. بە زەبری هێز یەک بە یەکی مافی هەزاران منداڵی ڕەسەنی ئوسترالی وەردەگیرێتەوە کە لە باوەشی دایکیاندا دەرهێنراون.

ئەم بابەتە بۆ کتێبێک جێ دەهێڵم (کە تەنانەت ناوی دیاری کراوە، بەڵام ناتوانم ئاشکرای بکەم) لەسەر دانیشتوانی ڕەسەنی ئوسترالیا، هیندیە سوورەکان، ئەفریقییەکان و هەموو ئەو گەلانەی لەسەر زەوی ڕووبەڕووی ستەمی "پیاوی سپی خۆرئاوایی" بوونەتەوە. با چوونە ژوورەوەیەکی خێرا بۆ بابەتە

سەرەکییەکەمان بکەین کە دایکە سەرسوڕهێنەرەکانە. ئێـوە چـی دەڵێن؟

بەڵام ها! ئەوە چی بەسـەر ئەو کەنـگەرە سـک زلەدا دێـت؟ بـۆچی بەو شـێوەیە بە خـراپ تەماشـام دەکـات و بەرەو ڕووم دێت؟

- ئای!

- خۆ ئەم ئاژەڵە مستەکۆڵە دەهاوێت!



- گیڤەی کرد و تێپەڕی!

- دەی وەرە! دەی!

- خـۆ ئەوە دووبـارە بەرەو کەرەڤانەکە گیڤەی کردەوە!

- هێـی! ئەوەی لەنـاو سکتدایە چییە؟

- ئای خودایە، خـۆ ئەوە بەچکەیە!

- ئای!

# هەم توورەکەدارە، هەم شیردەرە

هەر کەسێک کەم تا زۆر زانیاریی لە بارەی ئاژەڵانەوە هەبێت، بێگومان ئەم سێ شتە سەبارەت بە کەنگەرەکان دەزانێت:

١ -لە ئوسترالیادا دەژین.

٢- بە بازدان ڕێ دەکەن و مستەکۆڵە دەهاون.

٣- بێچووەکانیان لە توورەکەکانی سکیاندا هەڵدەگرن.



- سڵاو پووری!

- سڵاو ڕۆڵەکەم، لە کێ دەگەڕێیت؟

- من لە کەس ناگەڕێم، چاوپێکەوتن دەکەم، پرسیارێکم هەبوو.

- بپرسە! بەڵام پرسیاری سووک نەک قوورس.

- ئاسانە ئاسان! پووری، ئاژەڵێک هەیە پێی دەڵێن کەنگەر، بیستووتە؟

- بەڵێ، بەدڵنیاییەوە بیستوومە! دەزانی وڵاتێک هەیە بە ناوی ئوسترالیا؟ ئەها لەوسەری جیهانە. ئێمە دراوسێیەکمان هەبوو ناوی پوورە خەدیجە بوو. پێمان دەوت خەجێ. ئێستا کۆچی دوایی کردووە، خودا لێی خۆشبێت. هەموو نەوەکانی زڕخوشکەکەی بۆ کارکردن چوون بۆ ئەو شوێنە. ساڵانە جارێک دەگەڕێنەوە بۆ ئێرە. ئەو کەنگەرانەی باسی دەکەیت، لەو وڵاتەدا دەژین.

- وای! نایابە! باشە پووری، چی لەسەر کەنگەرەکان دەزانی؟ بۆمان باس دەکەیت؟

- بەڵێ بەدڵنیاییەوە! کەنگەرەکان ناتوانن بە ڕێکی بە ڕێگەدا بڕۆن. باز دەدەن، ئیتر بۆ هەر کوێیەک بڕۆن بە بازدان دەڕۆن. خودای گەورە بەو شێوەیە دروستی کردوون. ئەو بەدیهێنراوانە هەر یەکێکیان لە جۆرێکە.

- باشە پووری، چی دیکە لە بارەی کەنگەرەکان دەزانیت؟

- مستەکۆڵە دەهاون!

- چۆن؟

- وەک بۆکسەر، مستەکۆڵە و بۆکس دەهاون.

- ئەها! تێگەیشتم. بۆکس دەهاون. چی دیکە؟

- هەروەهــا لە ســکیاندا توورەکەیــان هەیە، پەروەردگــار بەو شــێوەیە دروســتی کــردوون. کاتێــک بێچوویــان دەبێــت، بیچووەکان دەچنە ناو ئەو توورەکــانەوە. گوانیشــیان هەر لە نــاو ئەو تــوورەکەدایە! بەڵــێ، بێچــووەکە خــۆی لــوول دەکــات و دەسووڕێت تا گوانی دایکی دەدۆزێتەوە، ئەهــا خــودای گەورە وای دروست کردووە تا ببێتە پەند بۆ مــرۆڤ، بەڵام کــێ گــوێی پێ دەدات.

- ئەی وا نییە؟ وا نییە توخوا؟ باشە ئەی دواتر؟

- بەو شــێوەیە لەســەر شــیری دایکــی گەورە دەبێــت و دوای چەند مانگێک هەر لەسەر شیرخواردن بەردەوام دەبێت تا گەشە دەکات. ڕۆڵەکەم، ئەمانە بێچوون، ئیتر دڵی دایــکە، ئەمــانە هەر لە توورەکەکەی سکیدا هەڵدەگرێت. بــۆ هەر کــوێیەک بــڕوات، هەڵیدەگرێت و لەگەڵ خۆیدا دەیبات.

- بەڵێ، هەر بەو شێوەیە.

- ئــێ خــۆ مــرۆڤیش هەر وایە، وا نیــیە؟ ڕۆڵەکەم، دایکــایەتی سەختە. ئادەی پێم بڵێ بۆچی پێکەنیت، با بزانم؟

- نا پێکەنینی چی، هیچ نەبوو.

- نۆ مانگ بە ســک هەڵیــدەگریت، پاشــان لە دایــک دەبێــت، ئینجــا لەباوەشــی دەگریــت و هەڵیــدەگریت، کــاتێکیش گەورە

بـوون، وەک ئەوەی هەڵیبگریـت، بەڵام ئەسـتەم دەیخەیـتە نـاو ئۆتۆمبێل و دەریدەهێنیتەوە. هێشتا ناتوانێت بـڕوات، لەبەر ئەوە دووبارە لەباوەشی دەکەیتەوە.

- چۆن چۆنی؟

- خۆ لە باوەشی ناگریت تۆش تێناگەیـت، لە دڵ و مێشـکتدا هەڵیدەگریت.

- ئەهـا! ئـای خـودایە! پـووریێ گیـان، زۆر سوپاسـت دەکەم. بەڕاستی چاوپێکەوتنێکی زۆر جوان بوو.

- هەر ئەوەندە بوو، تەواو؟

- بەڵێ پووریێ، تەواو.

- ئەی کوالا، با باسی کوالاشت بۆ بکەم!

- کوالا؟

- بەڵێ بەڵێ! لەسەر درەختی ئۆکالیپتۆس دەژین.

- چی کوالا؟ ئای خوایە! پووریێ، تۆ چەند نایابیـت، دەسـتم بدەریێ با ماچی بکەم!

- دەی ها ماچی بکە! ڕۆڵەکەم، نەکەیت دایکـت بڕەنجێنیـت. دایکـایەتی سـەختە. خـودا دەفەرموێـت: نابێـت بەرامبەریـان بڵێیت: ئۆف.

- وەڵڵا ڕاستە!

- کەلانەیەکت بۆ دروست بکەم؟

- ئەڵڵا کەلانە، ئۆف کە خۆشە کەلانە.

- ڕۆڵە، نەمانوت نابێت بڵێیت ئۆف.

- ئاخ!

- گاڵتە دەکەم! ئەم ئۆفە جیاوازە. ها بیگرە. لە ژێرەوە بیگـرە بـا ڕۆنەکەی پیاتا نەڕژێت! دوایـی کـێ بـۆت بشـوات و خـاوێنی بکاتەوە، بێگومان دایکت!

- زۆر بە تامە! پووریێ، دەستەکانت خۆش بێت!

- ڕۆڵە گیـان، نۆشـی گیانـت بێـت. سـەیری مـن بـکە! تـۆ سینگڵیت؟ لەم نـاحیەی خۆمـان کچێکـت بـۆ بـدۆزمەوە. ئەو کارە لەسەر من، تۆ لە کوڕێکی باش دەچیت. تەماشا بـکە، لەو خوارەوە لای مزگەوتەکە خانوویەکی زەرد هەیە...



لە جیهـــانی ئاژەڵانـــدا، خێزانێـــک هەیە بە نـــاوی شـــیردەرە توورەکەدارەکان[1]. دێوی تاسمانی، کوالا، کۆمەڵێک سـمۆرەی سەرسـوڕهێنەری باڵـدار، چەنـد جۆرێـک مشـک، ئینجـا کەنگەرەکان کە سەر بە خێزانی ئەم شیردەرە توورەکەدارانەن.

تایبەتمەنـدیی هاوبەشـی شـیردەرە توورەکەدارەکـان لەگەڵ شـیردەرەکانی دیـکەدا، شـیرپێدانی بێچووەکانیـانە. هەر لەبەر ئەوەیە هەموویان شیردەرن.

بەڵام جیـاوازییەکی بەرچـاو هەیە کە توورەکەدارەکـان لە شیردەرەکانی دیکە جیا دەکاتەوە.

بێچووی مانگایەک، کە وەک گۆلکێک دێتە دونیاوە، هەر لە مانگـایەکی بچـووک دەچێـت: واتە کاتێـک دەیبیـنن یەکسـەر دەڵێن: "ئەمە بێچووی مانگایەکە!"

بە هەمان شێوە، کاتێک بێچووی ورچێـک لەدایـک دەبێـت، لە ورچێکـی بچـووک دەچێـت. دروسـتتر بڵـێم: لە ورچێکـی بووکەڵە دەچێـت! بەڵام کاتێـک دەیبیـنن، دەتـوانن بەدڵنیـاییەوە بڵێن: "ئای چەند ورچێکی جوانە!"

بەڵام ئەگەر دایکـی لەو نزیکـانە بێـت، ئەوە زۆر گونجـاو نابێت. واتە: کاتێک مرۆڤ ورچێکی دایـکەی تـووڕە لەدوایەوە وەک هەورەگـرمە گـرمە گـرم بە دوایـدا ڕابکـات، ناتوانێـت

---

١ - (Marsupial): شیردەرە تورەکەدارەکان.

خۆشەویستیی خۆی دەرببڕێـت و بڵێـت: "بەخـوا بێچـووکەت زۆر نازدارە، ها! خۆزگە دەستم بەسەریدا بهێنایە! ناویشم بنـایە خـرپن!" لەو کـاتەدا گەورەتـرین کێشـە ڕزگـارکردنی گیـانی خۆیەتی، لەگەڵ دۆزینەوەی جلێکی ژێرەوەی خاوێن!

هەروەها کاتێک منداڵێکی ساوا دەبیـنن، خێـرا تێـدەگەن کە ئەوە کـــۆرپەی مـــرۆڤێکە. بێگومـــان هەنـــدێک کەس دوای ماوەیەک لە بـارەی خوشـک/براکـانی کە تـازە دێـنە مـاڵەکەوە، لێکدانەوەی جیاواز دەکەن!

- ئێستا ئەوە برا/خوشکی منە؟
- بەڵێ ئەی چۆن! جوانە، وا نییە؟
- بە ڕای من وا نییە!
- ها؟

بەڵام بێچووی شیردەرێکی توورەکەدار کە لە دایک دەبێـت، نە بەو ئەندازەیە لە دایکی دەچێـت، نە لە بـاوکی، چـونکە وەک ئاوڵەمە[1] دێتە دونیاوە. ئەو گەشەیەی ماویەتی لە سکی دایکیـدا تەواوی ناکـــات، بەڵکـــو لە پـــاش لەدایـــک بـــوون لە نـــاو توورەکەیەکی گەرمدا تەواوی دەکات کە چەنـد مانگێـک تیایـدا دەژی.

باشە، بەڵام چۆن؟

---

١- (Embryo): (بێچووی ناو سک کە هێشتا خۆی باش نەگرتووە).

دەتوانین لە کەنگەرەکانەوە بەمە ئاشنا ببین.

بەگشتی ئێمە تەنیا یەک جۆر کەنـگەر دەناسـین (کەنـگەری سوور)، بەڵام جۆرەها کەنگەری قەبـارە جیـاواز بوونیـان هەیە. بۆ نمـوونە، کەنـگەرە بچووکەکـانی وەک وەلابـی و پـادەمیلەن ( Wallaby و pademelon ) کە هێندەی کەروێشـکێک دەبـن. هەندێک جۆری کەنگەریـش هەن، وەک مەیموونەکـان لەسـەر لووتکەی درەخت هێلانە بۆ خۆیان دروست دەکەن.

بەڵام با هێندەی کەروێشک بچووک بن، بـا هێنـدەی بـاڵای مرۆڤ گەورە بـن، بـا لەسـەر زەوی بـاز بـدەن، لە لقـێکەوە بـۆ لقێکی دیکە بـاز بـدەن، هەمـوو کەنگەرەکـان تایبەتمەنـدییەکی هاوبەشیان هەیە، کە ئەویش: شیردەری توورەکەدارن.

**هۆکاری ئەوەی لەسەرەتای کتێبەکەوە باسـی کەنگەرەکـان دانراون، ئەو توورەکانەیە کە لە ناویاندا یەکێک لە سەرکێشـترین دایکـایەتی نائاسـایی لەسـەر زەوی ڕوو دەدات. هەرچەنـدە کاتێـک ئەم کتێـبە دەخـوێننەوە و تەواوی دەکەن، تێـدەگەن کە لەسەر ڕووی زەویدا، تاکە دایکـایەتیەک نییە سەرکێشـی تیایـدا ڕووی نەدابێت.**

**بەڵام پێویست بوو لە یەکێکیانەوە دەست پێ بکەین.**

**منیش کەنگەرەکانم بۆ هەڵبژاردن.**

# بێچووی کەنگەر

هەرچەنــدە مــاوەی مــانەوەی مــن لە ســکی دایکمــدا حەوت مــانگی خایانــد، بەڵام لە هەلــومەرجی ئاســاییدا، مرۆڤەکــان دوای مــانەوەی نــۆ مانــگ و ١٠ ڕۆژ لە ســکی دایکیاندا، دێنە دونیاوە، واتە: لەدایک دەبن.

ئەوە یەکێک لە خوێنەرەکــانم بەبەردەوامــی نــامە دەنێرێــت و لیســتی بەدیهێـنراوە سەرســوڕهێنەرەکانی بە هێنـدەی چیاکــانی تۆرۆس بەرز کردووەتەوە و و دەڵێـت: "ســەیرکە! ئەو بــابەتەش زۆر سەرســوڕهێنەرە. ئەمە و ئەوەش بنووســە!" جــا لە مــن دەپرسێت: "ئەوەی من بۆ حەوت مانگی خایاند؟"

جا گیانەکەم دەبێت لەبەر چی بێت، لەبەر ئەوە زوو لەدایـک بووم تا هەرچی زووە دەست بەکاری نووسـینی ئەو ژمـارە زۆرە کتێبە بکەم!

گــاڵتەم کــرد گاڵتە! لەدایکبـوونی پێشوەختە، دۆخێکی نەخــوازراوە، بەڵام هەنـدێک جـار ڕوو دەدات. بەگشــتی



کێشـەدارە، چـونکە لەدایکبـوون پـێش تەواوبـوونی گەشـەی ئەنـــدامە گرنگەکـــانی وەک ســـییەکان، کێشـــەی گەورەی لێدەکەوێتەوە.

لە نـاو خەڵکیـدا، ئەو کۆرپـانەی بەم شـێوەیە زوو لەدایـک دەبـــن، پێیـــان دەوترێـــت: منـــداڵی نەبەکـــام (پێشـــوەختە premature)، بەڵام بێگومـــان لە زانســـتی پزیشـــکیدا ئەمە هاوتایەکی هەیە، هاوتایەکی زانستی: فڕێدان!

**لە جیهانی شیردەرەکاندا، ماوەی دووگیانی یەک لە یەکتری جیاوازترن. بۆ نموونە، لە مرۆڤەکاندا نۆ مانگە، زەڕافەکـان ١٤-١٥ مـانگە، بێچـووە فیلەکـان دوو سـاڵ لە سـکی دایکیانـدا دەمێننەوە. ئاخر ئەوە هەر لە فیل دێت!**

**ئەم مـاوەیە لە شـیردەرە توورەکەدارەکانـدا زۆر زۆر کـورتە. بێچـووە کەنگەرێـک ٢٠ ڕۆژ، تـا نەتزانـی ٤٠ ڕۆژ لە سـکی دایکیدا دەمێنێتەوە.**

باشە، ئەم ماوەیە بۆ ئەوەندە کورتە؟

لەبەر ئەوەی کەنگەرەکـــان وەک کەنگەرێکـــی بچـــووک لە دایک نابن، بەڵکو وەک کەنگەرێکی ئـاوڵەمە دێـنە دونیـاوە، کە هێشتا گەشەیان تەواو نەبووە!

کەنگەرێکـی سـووری پێگەیشـتوو، کاتێـک لەسـەر پـێ بەهێزەکانی دواوەی ڕادەوەستێت، بـاڵای نـزیکەی دوو مەتـرە.

کێشـــی لە دەوری ١٠٠ کیلــۆدایە. وا دەزانرێـــت بێچـــووی ئاژەڵێکی ئەوەندە گەورە کاتێک دێتە دونیـاوە هێنـدەی مشـتێک دەبێت، بەڵام کاتێک کەنگەرەکـان دێـنە دونیـاوە، باڵایـان هەر ١,٥ - ٢ سـانتیمەتر دەبێـت. کێشیشـیان هەر چەنـد گرامێـک دەبێت.

تەنانەت ناتوانین بە بێچوویەکی تـازە لەدایکبـووی کەنـگەر بڵێین: "چاوی بە دونیا هەڵهێنـا"، چـونکە هێشـتا چاوەکانیشـی وەک قاچەکـــانی دواوەی و کلکـــی گەشـــەیان نەکـــردووە و تووکیشی نییە. هەر کە لەدایک بـوو، وەک گـورگێکی بچـووک بە دەستە بەهێزەکانی کە تەنیا لەشولاری خۆی هەڵـدەگرێت، بە تووکی سکی دایکیدا هەڵدەزنێت و سەردەکەوێت.

باشە، بۆ کوێ دەچێت؟

جا ئەم ئاوڵەمە بچووکە کوێ دەزانێت؟

چەکەرەیەکی باریـک کە لە ژێـر خاکـدا لە سـکی تـۆوێکی بچووکدا سەردەردەهێنێت، چەنـدە بەئاگـایە لە ئەسـتێرەیەک کە ١٥٠ ملیـۆن کیلـۆمەتر لە زەویـیەوە دوورە و وەک سـەرچاوەی ڕووناکی و گەرمی زەوی بەدیهێنراوە؛ ئـاوڵەمەی کەنگەرێکـیش هەر ئەوەنـدە لە تـوورەکەیەکی گەرم و پـارێزراو ئاگـادارە کە لە ناویـدا گوانێـک چـاوەڕێی دەکـات کە وەک کـانیی شـیر بەدیهێـــنراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی هەم چەکەرەکە، هەمـــیش

ئـاوڵەمەکە بـێ خـاوەن و بـێ چـاودێر نـین، یەکێکیـان بە لێهاتووییەکی چاوەڕواننەکراو لە ناسکییەکی لەو شـێوەیە، وردە وردە لەو خاکەی سەری کە دەیان کیلۆ خـاک و خـۆڵ و بەردی بە سەرەوەیە سەر دەردەکـات. ئەوی دیکەیـان وەک پەڕینـەوە بە دارستانێکی چڕی بناری چیایەکی گەورەدا، سکی دایکـی کە بە تووک داپۆشراوە دەبڕێت و دەگاتە توورەکەکە.

لەم مـاوەیەدا، ئەم ئـاژەڵە بزێـوە، کە ناتوانێـت لە شـوێنێک بسـەرەوێت، نە هەڵـدەبەزێتەوە، نە بـاز دەدات، بە ئـارامی تەماشای ڕووداوەکان دەکـات، وەک هەمـوو دایکـانی دیـکەی سـەر زەوی، بە هێمنـی و ئـارامییەکی میهرەبانییـانە، تەماشـای سەرکەوتنی بێچووەکەی دەکات.

کاتێک ئاوڵەمەکە لە کۆتاییدا دەگاتە تـوورەکەکە، ئینجـا کـاتی ئەوەیە تا گوانی دایکی دەدۆزێتەوە. لەنـاو تـوورەکەی کەنـگەرە مێیەکاندا چوار چلّی گـوان هەن. لەوانەش تەنیـا دووانیـان لەو کاتەدا شیریان تێدایە. یەکێکیان بۆ ئەو برا/خوشکەی کە تـازە لە توورەکەکە چووەتە دەرەوە، ئەوی دیکەیان بۆ خۆیەتی، چـونکە لە هەردوو چلّـی گـوانەکەوە شـیرێک کە لە ڕووی پێکهـاتەی خەسـتییەوە جیـاوازن، دێـتە دەر. ئەو شـیرەی پێویسـتە بـۆ ئاوڵەمەی کەنـگەرەکە، جیـاوازە لەو شـیرەی خوشـک یـان بـرا گەورەکەی پێویستی پێیەتی.




دەستەکانی کەنگەرە دایکەکە (قاچە کورتەکانی پێشـەوەی) کە جگە لە مستەکۆڵە هاویشـتن و لێـدان لەو دینگۆیـانەی ڕاویـان دەنێن، بە کەڵکی هـیچ شـتێکی دیـکە نـایەن و بـۆ دۆزیـنەوەی گوانە دروستەکە بـۆ ئەو بێچـووە بچـووکەی بە هێنـدەی دەنـکە فاسـۆلیایەک دەبێـت، هـیچ گونجـاو نـین. لەگەڵ ئەوەشــدا، کەنگەرە دایکەکە نازانێت کام چلێی گوانەیـان هـی ئەو بێچـووە تازە لەدایکبووەیەتی، هەر وەک چۆن ئـاوڵەمەکە و ئەو بێچـووە کەنــگەرەی کە تــازە لە تــوورەکەکە هـــاتووەتە دەرەوە و لەو چۆڵەوانیەدا هەر باز دەدات و زوو زوو خل دەبێتەوە، نایزانن.

بەڵام نە بێچـــووە پێگەیشـــتووەکە چـــڵە گـــوانی هەڵە هەڵدەبژێرێت و ئەو شیرە بخوات کە ڕزقی خوشک/براکەیەتی، نە ئاوڵەمەکەش کە چاوەکانی داخراون جـگە لەو چـڵە گـوانەی ئامادەیە و چاوەڕوانی دەکات، چڵە گوانی دیکە دەگرێت.

# کاتی شیرپێدان

ئـــاوڵەمەی کەنـــگەری بچـــووک، وەک ئەوەی بە دەســـتی گرتبێتـــی و بە چـــاوی بینیبێتـــی، ئەو گـــوانە دەدۆزێـــتەوە کە پـــێش لەدایکبـــوونی بـــۆی ئامـــادە کـــراوە و وەک هەمـــوو کـــــــۆرپەیەک بەوپەڕی حەزی خـــــــواردنەوە پێـــــــوەی دەچەسپێت.

ئەو شـــــیرەی لە گـــــوانەکە دێـــــتە دەرەوە، تەواو ئەوەیە کە ئـاوڵەمەکە پێویستی پێیەتـی و خەسـتییەکی هەیە کە دەتوانێـت بەئاسانی بیخواتەوە، بەڵام هەردەم وا نامێنێتەوە؛ بە تێپەڕبـوونی ڕۆژ و هەفتە و مانگەکان خەستیی شیرەکەش دەگۆڕێت.

چۆن بۆ گەورەبوون و گەشەکردنی بێچووەکە بە شـێوەیەکی تەندروست پێویست بکات، هەر بەو شێوەیە قۆنـاغ بە قۆنـاغ بە پێکهاتەیەکی نوێ دروست دەکرێت.

لە هەمـان کاتـدا، هەروەک گـۆڕینی شـیری ئەو گـوانەی تـایبەتە بە کەنـگەرە ئـاوڵەمەکە، شـیری ئەو گـوانەی دیـکە کە تایبەتە بەو برا/خوشکەی پێش چەند مانگێک هاتووەتە دونیاوە، دەگۆڕێـت. بەزەیـی و میهرەبـانیی، لە گوانەکـانی تـوورەکەی کەنگەرێـکەوە شـیر بەخەسـتی جیـا جیـا دەڕژێنێـت و دوو بێچووی پێ تێر دەکات.

دوای ئەوەی ئـاوڵەمەی کەنـگەری بچـووک گـوانی دایکـی گرت، بە درێژایی دوو سێ مانگ بەری نادات.

لەو ماوەیەدا، گەشەی تەواو دەکـات و تـووک دەردەکـات و چاوەکانی دەکاتەوە، کاتێک تەمەنی دەگـاتە شـەش مانـگ، بـۆ یەکەم جار لە تـوورەکەکە دێـتە دەرەوە. ئیـدی ئەو ئـاوڵەمەیەک نییە، بەڵکو بێچووە کەنگەرێکـی بچـووکی جـوانە. هەرچەنـدە دەتوانێـت لە تـوورەکەکە بێـتە دەرەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی هێشـتا دەستی نەکـردووە بە خـواردنی خـۆراکی تەواوکەر، هەرکاتێـک برسیی بـوو دووبـارە دەچێـتەوە نـاو تـوورەکەکە و لە خـواردنی شیری دایکـی بەردەوام دەبێـت کە تـام و خەسـتییەکەی بە پێـی تەمەنی گونجاوە.

هەروەها کاتێک بیەوێت لەگەڵ دایکیدا گەشت بکات، هەر لەناو تـوورەکەکەدا دەمێنێـتەوە، چـونکە هێشـتا ناتوانێـت وەک کەنگەرێـک بـاز بـدات. ئەگەر بشـتوانێت بە هێنـدەی دایکـی ناتوانێـــت بەخێرایـــی ئەنجـــامی بـــدات. جـــا ئەوە کاتێـــک ڕووبەڕووی هێرشی سەگە دڕندە کێوییەکانی وەک دینگـۆ، یـان ڕاوچییەکان دەبنەوە، پەنابردن بۆ توورەکەکە باشترین کارە.

لەم دۆخە مەترسـیدارانەدا، کەنـگەری دایـک وەک هەمـوو دایکەکان، سەرەتا گیـانی بێچـووەکەی ڕزگـار دەکـات، ئینجـا

گیانی خۆی. هەر کە بێچووەکەی چووەوە ناو تـوورەکەکە، بەو قاچە بەهێزانەی دواوەی بەخێرایی هەڵدێت.

کەنگەرەکان دەتوانن زۆر بەخێرایی ڕابکەن؛ بێگومـان ئەگەر ئەو هەڵـــبەزودابەزە بە ڕاکـــردن بـــزانن! بەڵام ئەو ســـەگە ڕاوچییانەشی بـۆ ڕاوکردنـی کەنـگەر پێگەیەنـدراون، کەم نـین. کەنگەرێـک کە بە بێچـووەکەی نـاو تـوورەکەکەیەوە ڕادەکـات، ناتوانێت بەپێی پێویست ڕابکات. کاتێک کەنگەری دایک زانـی ناتوانێـت بەو شـێوەیە ڕابکـات، بێچـووەکەی لە تـوورەکەکەی دەردەهێنێت و فڕێی دەداتە سەر درەختێک، یان بنی دەوەنێک!

ڕاوەستن ڕاوەستن! خێرا خەیاڵتان بۆ شتی دیکە نەچێت،



هەڵە بیــر مەکەنەوە! کەنــگەر ئەمە لە پێنــاو بێچووەکەیــدا دەکـــات، چـــونکە تەواو بەپـــێچەوانەی ئەو ئاڕاســـتەیەی بێچــووەکەی دانــاوە ڕادەکــات، هێنــدەی بتوانێــت بەخێرایــی دینگۆکان لەوێ دوور دەخاتەوە.

ئەگەر نەگیرێت و نەکەوێتە دەســت ســەگەکان، ئەوا هەر کە دۆخەکە ئارام بووەوە و سەگە دڕندەکان کە بەهۆی مانــدووییەوە زمانیان بە هێندەی بۆینباخێک تا بەرپێیان درێژبووە و وازیــان لە خواردنی گەنکەرێک بۆ ژەمی ئێوارە هێناوە، کەنــگەرە دایــکەکە بەســـەلامەتی دەگەڕێــتەوە بــۆ هەڵگــرتنەوەی ئەو بێچــووەی چاوەڕوانی دەکات.

دایکەکە و بێچووەکە یەکـتر لەئــامێز دەگــرن، مــاچی یەکـتر دەکەن و بــۆن بە یەکەوە دەکەن. بێچــووەکە بــاش برســی بــووە، بۆیە خێرا باز دەداتە ناو توورەکەکەی دایکییەوە و شــیرە بەتــام و خەستەکە چاوەڕوانی دەکات.

سەگە دڕنــدەکانی دینگــۆ کە لەم کیشــوەرە سەرنجڕاکێشــەدا ئازادن، ئەوانیش لە پێناو بێچووەکانیانــدا کە لە هێلانەکەیانــدا لە برساندا دەلوورێنن، دەکەونە دوای نێچیرێکی دیکە.

دڵنیابن کە ئەوانیش ئاوا بەئاسانی بە دەستبەتاڵی نــاگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە.

ڕەنگە نەتوانن کەنگەرێکی سووری گەورە ڕاو بکەن، بەڵام دەتوانن بە کەنگەرێکی بچووک هەموو بێچووەکانیان تێر بکەن. سەگێکی دایک هەرچەند دڕندەش بێت، چاوەکانی جگە لە بێچووەکانی هیچ نابینن.

بێچووە کەنگەرەکان، ئیدی لە هەشت مانگییەوە لەناو توورەکەکەی سکی دایکیاندا جێیان نابێتەوە.

با بڵێین کەنگەرە دایکەکان تا یەک ساڵ شیر بە بێچووەکانیان دەدەن، ئەو ماوەیەی دەمێنێتەوە، بێچووە کەنگەرەکان ئەگەر بەتەواوی نەشچنە ناو توورەکەکەوە، ئەوا سەریان دەکەن بە ناویدا و لەو چڵە گوانەی هی خۆیانە لە خواردنی بەشە شیرەکەیان بەردەوام دەبن.

ئەمەش بەبێ ترساندن و ڕاچڵەکاندنی خوشک/برا بچووکە ئاوڵەمەکەیان کە بە چڵە گوانەکەی تەنیشتەوە چەسپاوە و تەنانەت هێشتا چاوەکانی نەکردووەتەوە.

بەم شێوەیە، لە مێرگە پان و بەرینەکانی ئوسترالیادا، پێش کۆتاییهاتنی چیرۆکێکی نایابی دایکایەتی، دانەیەکی دیکە دەست پێ دەکات...



# دایکی زەڕافە



میسـری و ڕۆمانییە کۆنەکان، باوەڕیان وابـوو کە زەڕافەکـان بەرهەمی خۆشەویستیی نێوان حوشتر و پڵنگەکانن.

ئـێ! لە ڕاسـتیدا کە لە ڕووی دەرەوە تەماشـایان دەکەیـت، زۆریـش قـورس نیـیە تێبگەیـت کە بـۆ بەو شـێوەیە بیریـان کـردووەتەوە. لە ئەنجامـدا ئەم بەدیهێـنراوە جوانـانەی ئەفریقـا، هەم وەک حوشتر، هەمیش وەک پڵنگن!

بەڵام بێگومـان هـیچ زەڕافەیەک ناتوانێـت بەرهەمـی ئەم خۆشەویستییە زۆر مەحاڵە بێت. جـا ئەگەر وا بیـر بکەیـنەوە کە خۆشەویستیی پڵنگێک بەرانـبەر حوشـترێک، بەهـۆی گۆشـتی تازە و نەرم و چەورەکەیەوە بێت!

بەراورد بە ماوەی دووگیانیی مرۆڤەکان، کە نـۆ مانـگ و ١٠ ڕۆژە، کـۆرپەلەی زەڕافەکـان مـاوەیەکی زۆر درێژتـر لە سـکی دایکیاندا دەمێننەوە.

تێکڕای ماوەی دووگیانیی زەڕافەکان ١٤-١٥ مانگە.

سـەرنج بـدەن! لەم جیهـانەدا هـیچ شـتێک بەو شـێوەیە نابێـت بوترێـت: "دەی بـا ئەمەش بەو شـێوەیە بێـت". پێـوەرێکی ورد و بڕێکـی هەسـتیار و مـاوەیەکی دیـاریکراو بۆ هەموو شتێک دیاری کراوە.

بێگومـان هۆکارێـک هەیە کە زەڕافەکـان ئەم مـاوە زۆرە لە سکی دایکیاندا دەمێننەوە!

زەڕافە دایکەکان، بە پێوە بێچوویان دەبێت (دەزێن).

گـریمان زەڕافەیەک تێکـڕا ٥-٦ مەتـر بەرزە، ئەو کـۆرپەیەی لەدایـک دەبێـت، هەر کە لە سـکی دایکیـان دەرچـوون، لە بەرزیـی دوو مەتـرەوە دەکەونە خـوارەوە بـۆ سـەر زەوی. واتە: ئەگەر لە بـری ئەوەی بە زەڕافەیەک بڵێـین: "هـاتە دونیـاوە" یـان "چاوەکـانی بە دونیـا هەڵهێنـا"، بڵێـین: "کەوتە دونیـاوە" شـتێکی هەڵەمـان نەوتـووە. ئەگەر مـاوەی دووگیـانییەکە ئەوەنـدە درێـژ نەبـووایە، ئەوا کاتێـک لەدایـک دەبـوون، ئەوەنـدە بچـووک و لاواز دەبـوون کە بەرگەی کەوتنەخوارەوەیان لەو بەرزاییەوە نەدەگرت.



زەڕافە دایکەکان، بە پێوە بێچوویان دەبێت (دەزێن). گریمان زەڕافەیەک تێکـــــڕا ٥-٦ مەتـــــر بەرزە، ئەو کۆرپەیەی لەدایک دەبێـت، هەر کە لە ســـکی دایکیـــان دەرچـــوون، لە بەرزی دوو مەتـــــــــرەوە دەکەونە خوارەوە بۆ سەر زەوی. واتە: ئەگەر لە بری ئەوەی بە زەڕافەیەک بڵێـین: "هـاتە دونیـاوە" یـان "چاوەکـانی بە دونیـــا هەڵهێنـــا" ،بڵێـــین: "کەوتە دونیاوە" شتێکی هەڵەمان نەوتووە.



بەڵام بێچــووە زەڕافەکـــان، باڵایـــان نــزیکەی دوو مەتـــر و کێشیان ٦٥-٧٠ کیلۆ دەبێت، لەبەر ئەوە جەستەیان پـتەوە و بەم کەوتنەخوارەوەیە هیچ زیانێکیان پێناگات.

بێگومان ئەگەر لە خوارەوە پڵنگێـک چـاوەڕوان نەبێـت و بە وتنی: "من باوکی تۆم! سەیرکە پەڵەکـانی سەرجەسـتەمان وەک یەکە! ئەها بەمە دەڵێن بۆمـاوەیی. ئێسـتا وەرە بـا یەکـتر لەئـامێز بگرین!"

هیچ پڵنگێک، تەنـانەت هـیچ شـێر و کەمتیـارێکی پەڵاوی چەقاوەسوو یان ئاژەڵێکی دڕندەی وەک ئەمانە، هێندە بوێر نییە، یان دروستتر بڵێم، هێندە گێل نییە بچێتە بـن پێکـانی زەڕافەیەک کە خەریکە بێچووی دەبێت و پێش ئەوەی بێچووەکەی بکەوێتە سەر زەوی لە هەوادا پەلاماری بدات. بەڵام دەتوانێـت لە پشـت دەوەنێکەوە خۆی حەشار بدات و فرسـەتی لـێ بهێنێـت! لەبەر

ئەوە نە زەڕافە دایکەکان کاتیان هەیە تا بڵێن: "خۆ من تازە بێچووم بووە، با چلەم بچێت و کەمێک پاڵ بکەوم و پشوو بدەم!" نە کاتیشیان هەیە لەو شوێنەی بێچووە زەڕافەکان کەوتوونەتە دونیاوە، بەسەری بەرن.

بێچووە زەڕافەیەک هەر کە کەوتە سەر زەوی، لە ماوەیەکی زۆر کورتدا دەبێت بە خۆیدا بێتەوە، تەنانەت هەڵسێتە سەر پێ.

لە ڕاستییدا کەوتنەخوارەوەی لە بەرزیی دوو مەترەوە، سوودی بۆ بێچووە زەڕافەکە لەو ڕووەوە هەیە. بە هۆی کاریگەریی بەرکەوتنەکەوە ڕادەچڵەکێت، لەو شوێنەی پاڵکەوتووە ڕاست دەبێتەوە. دەتوانن ئەمە هاوشێوە بکەن بە زللەلێدان لە سمتی منداڵی ساوای تازە لەدایکبوو لەلایەن مامانەکانەوە.

**باشە، بۆچی مامانەکان ئەو زللەیەی لێ دەدەن؟ لەبەر ئەوەی پێویستە منداڵی تازە لەدایکبوو هاوار بکات و بگری، دەست بە هەناسەدان بکات و هەرچی زووە سییەکانی بکرێنەوە. هەندێک منداڵ هەر لەگەڵ لەدایکبوونیدا دەست بەگریان دەکەن، بەڵام هەندێکیان هێشتا هەستیان بە ڕووداوەکە نەکردووە و وا دەزانن هێشتا لە سکی دایکیاندان. لەبەر ئەوەی وا هەست دەکەن کە هەرچۆنێک بێت خۆراک و ئۆکسجین لە**

**دایكییەوە بۆی دەچێت، خەرمانەكەیان تێكنادەن. ئـا لەو كـاتەدا دەبێت زللەیەک بخۆن، تا هۆشیان بە بەردا بێتەوە.**

بێچـووە زەڕافەكـان كە دەكەونە سـەر زەوی، دەڵـێن: "خـۆ لەدایک بووین!" ئینجا كەمێک بەهۆش خۆیانـدا دێـنەوە، بەڵام لەوانەیە كەمێـک حەز نەكەن هەسـتنە سـەر پـێ. لەم جـۆرە حاڵەتانەدا زەڕافە دایكەكە بە قاچی تێـوەی دەژەنێـت بـۆ ئەوەی بێچووەكەی وەک مانگا پاڵ نەكەوێت و هەڵسێتە سەر پێ!

نا گیانەكەم! ئەم كارانە لە جیهانی مرۆڤەكاندا بەم شـێوەیەن. لە جیهـانی زەڕافەكانـدا دایـكەكە بە قاچەكـانی پێشـەوەی (دەسـتەكانی) شـەق لە بێچـووەكەی دەدات! پاشـان دانەیەكـی دیـكەی تـێ دەسرەوێنێـت! ئەگەر لە دوورەوە تەماشـای ئەم ڕووداوە بكەن، زۆر شت بە زەڕافە دایكەكە دەڵێن.

- ئاه! ئەی داوەشێی!

- دادە گوڵزار، چی بووە!

- كچێ سەیركە! چۆن شەق لە بێچووەكەی دەدات؟

- ئای بەداخەوە!

- یاخوا دایكانی وەک تۆ بمرن و بچنە ژێر گڵەوە!

- سەیركە! هێشتا لێی دەدات!

- دەنا! دەنا!

- دادە گوڵزار، دەنا چییە، ئاخر دەنا چییە!

- شکۆفه، له خه‌فه‌تتدا ئاگام له خۆم نییه، نازانم چی ده‌ڵێم؟ لێی مه‌ده! لێی مه‌ده! خوا له ناوت به‌رێ!

بێگومان زه‌ڕافه دایکه‌که بۆ ئازاردان و زیانگه‌یاندن به بێچووه‌که‌ی ئه‌و کاره ناکات. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ناچاره هه‌رچی زووه فێری هه‌ڵسانه سه‌ر پێی بکات، کارێکی له‌و شێوه‌یه ده‌کات. له ئه‌نجامدا، بێچووه‌که که شه‌قه‌که‌ی خوارد، له پاش هه‌ڵنانی یه‌ک دوو هه‌نگاو به له‌رزه له‌رز، خێرا ڕاست ده‌بێته‌وه. جا بڵێ چۆن؟

- ئای ئای! خۆ ئه‌وه هه‌ر لێی ده‌دات! ئێستا نیشانت ده‌ده‌م!

- داده گوڵزار، ڕاوه‌سته مه‌ڕۆ! داده گوڵزار...

زه‌ڕافه دایکه‌که شه‌قێکی دیکه له بێچووه‌که‌ی ده‌دات که هه‌ڵساوه‌ته سه‌ر پێ و ده‌یخات به زه‌ویدا. بۆ ئه‌وه‌ی دووباره هه‌ڵسێته‌وه، به‌رده‌وام ده‌بێت له تێهه‌ڵدانی. هه‌موو ئه‌مانه بۆ ئه‌وه‌یه بێچووه‌که فێری هه‌ڵسانه سه‌ر پێ بکات. ئه‌گینا زه‌ڕافه دایکه‌کانیش وه‌ک هه‌موو دایکانی دیکه به‌رانبه‌ر بێچووه‌که‌یان ناخیان پڕه له میهره‌بانی و خاوه‌نی دڵێکی گه‌وره‌ن. به جۆرێک له جیهانی ئاژه‌ڵاندا به یه‌کێک له‌و ئاژه‌ڵانه ئه‌ژمار ده‌کرێن که به گرنگیدان به بێچووه‌کانیان به‌ناوبانگن.

بێچووە زەڕافە بچووکەکە کە هەڵساوەتە سەر پێ (وا مەزانن کە دەڵێم بچووک، ئیتر بچووکە، باڵای دوو مەتر بەرزە ها) بۆ ماوەیەکی زۆر بە هیچ شێوەیەک لە دایکی دوور ناکەوێتەوە.

لە دۆخی مەترسیداردا، دایکی بێچووەکەی دەخاتە نێوان قاچەکانی و بە قاچەکانی پێشەوەی بەرگری دەکات و شەق دەهاوێت، هەم خۆی، هەمیش زیاتر بێچووەکەی دەپارێزێت. شەقی زەڕافەکان زۆر توندە. بێگومان بەو شێوەیەی لە دوژمنەکانی دەدات، وا لە بێچووەکەی خۆی نادات. لێدانەکەی تەنانەت شێرێک بۆ ماوەی چەند مانگێک لە پەل و پۆ دەخات.

- کاکە ئارۆ، خوا شیفات بدات. ئەوە چۆن بوو؟

- باشم لالۆ. سەرم تاساوە، بەڵام ئەم گوێچکەیەم هەر دەزرنگێتەوە و تەواو نابێت!

- ئەبێ ئەو ئاژەڵە بێمێشکە چۆن لێی دابیت؟

- لالۆ، زۆر بەخراپی لێیدام.

هەر لە دوای لەدایکبوون، زەڕافە دایکەکە بێچووەکەی بە جوانی دەلێسێتەوە و خاوێنی دەکاتەوە. لەوانەیە بزانن کە زەڕافە زمانێکی زۆر درێژی هەیە (نیو مەتر دەبێت) و بۆ ئەم کارە زۆر باشە.



لە ڕاستییدا ئەم لێسانەوە و شۆردنە تەنیا بابەتێکی پاک و خاوێنی نییە. لە کاتێکدا زەڕافە دایکەکە بێچووەکەی دەلێسێتەوە، لە هەمان کاتدا بۆنی پێوە دەکات و بۆنەکەی لە ناخیدا جێگیر دەکات، چونکە زەڕافەکان کە حەزیان بە ژیانی خێزانیی بەکۆمەڵە لەسەر شێوەی ڕەو، هەرچەندە پەڵەکانی سەر هەر یەکێکیان وەک هێڵەکانی سەر پەنجەی مرۆڤەکان لە یەکتری جیاوازن، بەڵام ئەوان بێچووەکانیان بە بۆنیاندا دەناسنەوە، نەوەک پەڵەکانی سەر جەستەیان.

# تیمساحەکانیش خۆشیان دەوێت!



بەگشتی کەسانی بێبەزەیی ڕوخساریان لە یەکتری دەچێـت. کەسانی میهرەبانیش هەر یەکێکیان جوانییەکی هەیە.

کەسانی بێبەزەیی هەمیشە ڕوخسارێکی مۆناوی، چاوانێـک کە لە هەمـــوو کاتەکـــانی ڕۆژدا ناســـازانە تەماشـــا دەکەن، ڕوخسارێکی گرژ کە وا هەسـت دەکەیـت لە گیانـدارانی دیـکە سەرنجڕاکێشـترە، لەگەڵیـدا ڕەشـــهەڵگەڕاو، بە جۆرێـک هـیچ خەنـدەی نـاکەوێتە سـەر و پێکەنینـی لـێ نـایەت، تەنـانەت ئەوانەشی کەمێک سەیری دەکەن، لێی بێزار دەبن.

ئاگاداربن ها! دەڵێم ڕەشهەڵگەڕاو، ناڵێم ئەسمەر و برۆنـزی و ڕەش. دەڵـێم ڕەشـــهەڵگەڕاوە، ئەویـش بەهـۆی خراپـی و بێبەزەییەوە.

وەک چۆن میهرەبانیی و بەزەیـی، هەڵسـوکەوتەکانی مـرۆڤ دەگۆڕێت، ڕوخساریشیان دەگۆڕێت.

هەر لەبەر ئەوە لە ڕوخساری هەمـوو دایکانـدا جـا ئەوانەی هێشتا بێچووەکانیان لە سکیاندایە، یان تازە بێچوویان بووە، یان

بێچووه خۆشەویستەکانیان لەئامێزیاندایە ڕووگەش و ئارام و نیگایەکی جوان و هەڵسوکەوتێکی نەرمیان هەیە.

هەموو منداڵان جا تەمەنیان ٥ یان ٤٥ یان ٧٥ساڵ بێت کە بەخۆشەویستییەوە تەماشای ڕوخساری دایکیان دەکەن، زۆر باش دەزانن خەوتن لەسەر سنگی گەرم و نەرمی ئەو دایکە ڕووگەشانە و خواردنی ئەو شیرە بەتام (بێگومان ئیدی کەسمان بیرمان نایەتەوە کە چەندە بەتام بووە) و تێرکەر و هەمیش شیفادەرە کە پێش ئەوەی ئەوان بێنە دونیاوە ئامادە کراوە، چۆنە.

چونکە کاتێک ئەوان بە خۆشەویستییەوە لە ڕوخساری دایکیان دەڕوانن، دایکیشیان، هەم بە خۆشەویستییەوە، هەمیش بەبەزەییەوە کە هەستێکی بەهێزە و زۆر لە خۆشەویستی گەورەترە لە ڕوخساری ئەوان دەڕوانن.

هەرگیز لەبەرچاوی دایکاندا بێچووەکان گەورە نابن، لەبەر ئەوە تەنانەت ئەگەر لە ڕووکەشیشدا وا دیاربن کە ئیدی هیچ پێویستییەکیان نییە، بەڵام هەمیشە پێویستیان بەم نیگا میهرەبان و بەبەزەییە هەیە. بەڵام مرۆڤەکان بەهۆی ئەوەی لە پاش لەدەستدانیان هەست بە شتە زۆر جوان و بەهادارەکان دەکەن، کاتێک دایک و باوکە خۆشەویستەکەیان کۆچی دوایی دەکەن و هەرگیز جارێکی دیکە چاوەکانیان بۆ ئەم دونیایە ناکرێنەوە،

هەست بەو نیگا میهرەبانییەی دایک دەکەن کە چەندە پێویستیانە.

باشە، ئاخر بۆ خاتری خوا، ئەو میهرەبانییە چییە؟ کە وا لە دایک دەکات ڕوانینی بۆ بێچووەکەی بگۆڕێت، وا لە گیاندارێک بکات لە خۆی زیاتر گرنگیی بە گیاندارێکی دیکە بدات؟

بەزەیی و میهرەبانیی، نە لە خۆردا هەیە، نە لە شاخ و بەرد و خاک و ئاو و درەختدا هەیە.

میهرەبانیی، شتێک نییە لە گۆشت و ئێسک و ماسوولکە و ڕیشاڵ و شانە و خانە و گەرددا هەبێت، هەستێکی بەزەییە، بەڵام زانستی زیندەزانی وەک چۆن نەیتوانی ڕوونکردنەوە بۆ چەندەها موعجیزەی بێشومار بدۆزێتەوە، بە هەمان شێوە ناوێکی بێمانای وەک "غەریزە"ی پێدا.

بەزەیی، ناوە پیرۆزەکانی ڕەحمان و ڕەحیمی پەروەردگارمانە، کە لە دڵی دایکاندا دەدرەوشێتەوە، وەک چۆن تیشکی خۆر لە ئاوێنەکان و گەردیلەکانی ئاوەوە تا شووشە ڕوون و پارچە ئەڵماسەکان ڕەنگ دەداتەوە و دەدرەوشێتەوە.



جا لە دڵی تیمساحێکی سامناکدا بێت، یان لە دڵی ماری پایتۆندا کە هێندە ترسناکە ئەوانەی دەیبینن زیڕە دەکەن، لە دڵی شێرێکدا کە بە یەک لێدانی دەستە بەهێزەکانی ئاسکێکی کێوی تەختی زەوی دەکات، پڵنگێک کە بەهرەدارترین پشیلەی سەر زەویە، کەمتیارێکی زۆر دڕندەی پەلاوی، کیسەڵێک، مریشکێکی ترسنۆک، باڵندەیەکی نەورەس، یاخود لە دڵی پەپوولەیەکدا بدرەوشێتەوە کە بەوردی هێلکەکانی وەک مرواری بچووک لەسەر گەڵایەکی کەلەرمی گەورەی تەڕ ڕێک دەخات. کاتێک زیندەوەرێک دەبێتە دایک، وەک ئەوە وایە جارێکی دیکە و دووبارە بەدیهێنرابێتەوە و بە میهرەبانییەکی بێهاوتا و بەزەییەکی موعجیزەئاسا چاودێریی بێچووەکەی دەکات کە لە گیانی خۆی خۆشتری دەوێت.

دڵـــی هەمـــوو دایکـــانی ســـەر زەوی، وەک ئـــاوێنەیەکی پاکوخاوێن و بێپەڵەیە، ناوەکانی ڕەحمان و ڕەحیمی بەدیهێـنەر، کە بەبەزەیـــیە و زۆر زۆر میهرەبـــانە، دەخـــاتە بەر ئەو چـــاوانەی دەبینـــین، ئەو دڵانەی هەســـت دەکەن و دەرکـــی پـــێ دەکەن. جۆرەهـــا دڕنـــدەی سەرســـوڕهێنەر کە کاتێـــک تەماشـــای ڕوخســـاریان دەکەیـت، تۆزقـــاڵە گەردێـک بەزەییـــان لـــێ بەدی ناکرێت، کاتێـک دەبـنە دایـک، هەر یەکێکیـان دەبـنە پـاڵەوانی میهرەبانیی، بەرانبەر بێچووەکانیان وەک لۆکە نەرم.

نموونەتان دەوێت؟ ئەوەندە نموونە هەیە نەبێتەوە! بەڵام مـن تەنیـــا یەک دانەیـــانم هەڵبـــژارد. وا بـــزانم ئەم بژاردەیەشـــم کـــاریگەریی کتێبـــی پێشـــتری زنجیـــرەی بەدیهێـــنراوە سەرسوڕهێنەرەکانی لەسەرە، کە ئەویش کتێبی **خشۆکەکانە**.

## ئێشکگریی تیمساحی دایک بە دیار هێلکەوە

کاتێک تیمســـاحێک دەبێـتە دایـک، بێگومـان ئەو ڕوخســـارە بەدبەختەی ناگۆڕێت، بەڵام نیگای دەگۆڕێـت، بێگومـان تەنیـا بەرانـــبەر بێچووەکـــانی خـــۆی! ئەگینـــا ئەگەر بچـــنە لای تیمســـاحێکی دایـک و لێـی بپرســـن: "چـۆنە وازت لە شـیردان

هێناوه و دەستت بە خۆراکی تەواوکەر کردووە؟" لەناکاو دەبنە خۆراکی تەواوکەر.

وتت شیرپێدان؟ تیمساحەکان وەک هەموو خشۆکەکان هێلکە دەکەن. ئەو گیاندارانەشی هێلکە دەکەن، شیر نادەنە بێچووەکانیان، چونکە شیردەر نین، جگە لە پلاتەپەس[1].

تیمساحەکان کە لە کەناراو و زۆنگاو و دەریاچەکاندا دەژین، کاتی هێلکەدانان دەچنە وشکانی و لە ناو لم یان قوڕدا چاڵێک دروست دەکەن، بەڵام پێویستە پلەی گەرمیی هێلکەکان لە ٣٠ پلە تێنەپەڕێت. لەبەر ئەوە تیمساحە دایکەکە دەبێت شوێنێک بدۆزێتەوە کە ڕاستەوخۆ تیشکی خۆری بەرنەکەوێت.

دایکەکە کاتێک شوێنێکی گونجاوی دۆزییەوە و چاڵەکەی هەڵکەند، هێلکەکانی تێدا دادەنێت. دوای ئەوەی سەری چاڵەکەی بەوریایی داپۆشی، زۆر دوور ناکەوێتەوە و لە شوێنێکی نزیکدا چاوەڕوانی تروکاندنی هێلکەکانی دەکات، چونکە ژمارەیەکی زۆر لە ئاژەڵەکان جا ئەگەر تیمساحێکی مێیەش بێت، چاویان لەسەر ئەو هێلکە بەتامانەیە کە سکیان تێر دەکات.

---

١ - Platypus: گیاندارێکی شیردەری هێلکەکەرە کە لەشێوەی مراوی دەچێت، بەڵام فەروویەك جەستەی داپۆشیوە، ئەم جۆرە گیاندارە لە باشووری ئوسترالیادا دەژین و ڕەچەڵەکیان بەرەو نەمان دەچێت.

**تیمساحی مێیە تا سێ مانـگ بە دیـار هێلکەکـانیەوە ئێشـک دەگرێـــت. لەم مـــاوەیەدا ناتوانێـــت هـــیچ بخـــوات،** مەگەر باڵندەیەکی چاوبرسیی گەمژە خۆی بچێـتە دەمـیەوە. زۆر لاواز دەبێـت، کێشـی دادەبەزێـت و بێهێـز دەبێـت، بەڵام هەرگیـز هێلکەکانی جێ ناهێڵێت.

ئەم تیمسـاحە کە پـێش چەنـد هەفـتەیەک هەر نێچیرێکـی گرتبێت، کەروێشک، پشیلە، مریشک یان مرۆڤ بووبێـت، جـا خـــودای دەکـــرد مامۆســـتای لەشـــجوانیش بووبێـــت، ئەوا لە هاڕینیان بە چەناگە بەهێزەکانی و ددانە تیژەکانی چێژی دەبینـی، بەڵام کە دەبێـتە دایـک، ئیـدی بەم شـێوەیە دەگۆڕێـت، بە دیـار هێلکەکـانیەوە کە لە چاڵێکـدا دانـاون، بە برسـێتی چـاوەڕوان دەبێت، کە کاتی چاوەڕوانکراو هات، بێچووە تیمسـاحەکان کە تـــامەزرۆی ســـەردەرهێنانن لە هێلکەکانیـــان، بە دەنگـــی بەرز دەســـت بە هـــاوار دەکەن، دەنگێـــک کە دەتوانرێـــت لە دووریی ٢٠ مەترەوە ببیسـترێت. تیمسـاحە دایـکەکە بە هەمـوو سـەرنج و هەسـتیەوە مـاوەی چەنـد مـانگێکە چـاوەڕوانی ئەو دەنگە دەکات.

هەر کە دەنگـــی بێچووەکـــانی بیســـت، بە وتنـــی: "بێچووەکانمم!" بە جۆشوجرۆشەوە بەرەو هێلانەکە ڕادەکـات و بەخێرایی خۆڵەکەی سەری لادەبات و بێچـوو و هێلکەکـانی دەردەهێنێت.



ئەگەر بەشێک لە بێچووەکانی توانیبێتیان هێلکەکان بشکێنن و بێنە دەرەوە، هێشتا هەندێکیان لە ناو هێلکەکەدا ماون.

تیمساحە دایکەکە، ئەو ددانە تۆقێنەر و تیژانەی بە هەستیارییەکی زۆرەوە بەکار دەهێنێت و یەک بە یەک توێکڵی هێلکەکان دەکاتەوە و بێچووەکانی دەهێنێتە دەرەوە کە هەر یەکێکیان یەک لە یەکتری خۆشەویستترن لە لای (بێگومان تیمساحێک دەتوانێت چەندە بێچووەکەی خۆش بوێت).

دایکەکە برسییەتی، ئەوەندەی بتوانێت دەمی دەکاتەوە و هەموو بێچووەکانی دەخاتە ناو دەمییەوە، بەڵام تەنانەت بچووکترین زیان بە هیچ کامیان ناگەیەنێت. ئەو چەناگە بەهێزە، ئەو ددانە تیژانە، بۆ بێچووە تیمساحەکان بە هێندەی ژوورێکی یاریکردن سەلامەت و جێگەی بەسەربردنی کاتێکی خۆشە.

تیمساحە دایکەکە، ئەو بێچووانەی کە دەمی لێ پڕ کردوون، تا ناو ئاوەکە دەبات. بێچووەکان کە لە لەدایکبوونەوە، دروستتر بڵێم: لەوەتەی لە هێلکە هاتوونەتە دەرەوە هەر یەکێکیان مەلەوانێکی باشن، بێ ئەوەی کات بەفیڕۆ بدەن، سوود لە نیعمەتەکانی ناو ئاوەکە وەردەگرن، دەست دەکەن بە خواردنی هەرچییەک بتوانن بیگرن، وەک کرمەلیقە و بۆق و سەرەمێکوتەکان. بەڵام لەبەر ئەوەی هێشتا بچووکن و پێستیان تەنکە، نێچیرێکی بەتامن بۆ باڵندەی ئاویی دەنووک درێژ و ڕاوچییە گۆشتخۆرەکان کە بەدەوریاندا دەسوڕێنەوە. بەو هۆیەوە پێویستە تا دوو سێ مانگ لەبەرچاوی دایکیاندا بن و جیا نەبنەوە. دایکیشیان خۆی بەدرێژایی ئەم ماوەیە هیچ جێیان ناهێڵێت و پشتگوێیان ناخات.




بەخێرهاتی.
هیچ
لەیەک ناچن!

# ورچی مێیەی جەمسەری، هێلانە دروست دەکات



ورچە جەمسەرییەکان، گەورەترین و بێبەزەییترین گۆشتخۆرن لەسەر ڕووی زەوی. بەوەی لەو بووکەڵە ورچانە دەچن کە لە بازاڕەکاندا دەفرۆشرێن، هیچ فریو مەخۆن. هەر کاتێک ڕووبەڕووی ورچێکی جەمسەری بوونەوە- بێگومان پێویستە بۆ ئەوە بچن بۆ جەمسەرەکان- خێرا ڕاکەن!

هەرچەندە ڕاکردنیش زۆر سوودی نابێت، چونکە ئەم ئاژەڵە قەبارە گەورەیە دەتوانێت بە خێرایی ئەسپ ڕابکات، بەڵام لانی کەم لە ژێر ئەم ئاسمانە شینەدا، دەتوانن بە دڵی خۆتان یەک دوو هەناسەی کورتی دیکە بدەن.

لە ڕاستییدا من لەم ورچە جەمسەرییانە تێدەگەم. وەک ورچەکانی دارستان، دەستێکیان لە هەنگویندایە، دەستێکیان لە لقی درەختی هەرمێدایە، لە ڕووباریشدا ماسی سەلمۆن و ماسی بۆنیتۆ (bonito)، لە شاخدا کەستانە دەخۆن و ژیانێکی نایاب دەژین.

له سەختترین ناوچەی زەویدا دەژین، لەو شوێنەی منداڵانی ئێسکیمۆ بـۆ ئەوەی بتـوانن دۆنـدرمەکەیان بخـۆن، دەبێـت بـۆ ماوەیەک لەبەر ئاگردا دایبنێن.

مـرۆڤ لەو جەمسـەرانەدا ئەو چـایەی دەیخـواتەوە هێشـتا نەگەیشتووە بە ڕیخۆڵەی دوانزەگـرێ، لە گەدەیـدا دەیبەسـتێت. لەبەر ئەوە زۆر ئاسـاییە کەمێـک شـەڕەنگێز بــن. جـا ئەگەر کۆرپەیەکیشیان هەبێت کە پێویسـت بکـات چـاودێری بـکەن و گەورەی بکەن، نان و ئاوی پێ بدەن.

جـا ئەوە ئەگەر لەم نیشـتمانە سـاردەدا، کە پلەکـانی گەرمـا دەیان پلە لە ژێر سفری سەدیەوەن، منـداڵێک بهێنێـتە دونیـاوە و بەخێـوی بکەیـت، کـارێکی ئێجگـار سـەختە. پێویسـتی بە فیـــداکارییە، لەبەر ئەوە دڵنیــــابن ورچە جەمســــەرییەکان فیداکارترین و پشوودرێژترین دایکانی سەر زەوین.

بێگومان لە پاش دایکـی مـرۆڤ کە لەگەڵ ئەمـانەدا لەسـەر هەمان زەویدا دەژین.

لە هەلومەرجی ئاسـاییدا، ورچە جەمسـەرییەکان پێویسـتیان بە هـێلانەیەک نیـیە، بەڵام ورچـی مێـیەی جەمسـەر کاتێـک دووگیـان دەبێـت، ئەو کـاتە پێویسـتی بە هـێلانەیەک دەبێـت. چونکە بێچووەکانی ورچی جەمسەری کاتێک لەدایک دەبن بێ

تووک و کوێرن. بۆیە پێویستیان بە هێلانەیەک دەبێت تا گەورە دەبن و بەجوانی گۆشت و چەوری دەگرن و گەشە دەکەن.

هەروەها ورچە جەمسەرییەکان وەک ورچەکانی دیکە ناچەنە خەوی زستانەوە، تەنیا ورچە دووگیانەکان یان ئەو ورچە مێیە جەمسەرییانەی لە سەرەتای زستاندا تازە بێچوویان بووە، لە پێناو بێچووەکانیاندا زستان لە هێلانەدا بەسەر دەبەن.

ورچی جەمسەری دایک، پێش هێنانە دونیای بێچووەکانی پێویستە سەرەتا لەو هەلومەرجە سەختەدا لانەیەکی گونجاو دروست بکات.

لەوانەیە لە یەکەم نیگادا پێتان وا بێت دروستکردنی لانەیەک لە شوێنێک کە بە بەفر داپۆشراوە ئاسان بێت. بەڵام لانەی ورچێکی مێیەی جەمسەری زۆر زیاترە لە کونێک کە بەلادانی کەمێک لە بەفرەکە دروست کرابێت.

ئەو لانەیەی ورچەکە دروستی دەکات، تونێلێکە دوو مەتر درێژە و لە کۆتایی تونێلەکەشدا ژوورێکی دانیشتن هەیە بە پانیی نیو مەتر. ئەم ژوورانە، هەمیشە بە شێوەیەک دروست دەکرێن کە لەسەروو دەروازەی لانەکەدان.

باشە، لەبەر چی؟

ئەگەر مامۆستا بوومایە، ئەم پرسیارەم لە تاقیکردنەوەدا دەهێنایەوە. دروستتر بڵێم: لە تاقیکردنەوەیەکدا ئەم پرسیارەم

دەکرد و هیچ پرسیارێکی دیکەم نەدەهێنایەوە. ئەوەشی وەڵامی ڕاستی بدامایەوە، بووکەڵەیەکی ورچی جەمسەری دروستکراوی وڵاتی چینم دەکردە دیاری بۆی. بەڵام وا بزانم ئەوە بەگران لەسەر من دەکەوت، چونکە زۆرێک لە قوتابییانی پۆلەکە لە بارەی ورچی جەمسەرییەوە زانیاریی باش دەزانن و پرسیارەکەیان بەئاسانی دەزانی.

ورچە جەمسەرییەکان، ژوورەکان لەسەرەوەی دەروازەی لانەکانیاندا دروست دەکەن، چونکە وەک لای هەمووان زانراوە، هەوای گەرم سەردەکەوێت. ئەگەر ژوورەکان لەگەڵ دەروازەی لانەکەدا لە هەمان ئاستدا بوونایە یان لە خوارووترەوە بوونایە. ئەوا گەرمیی جەستەی ورچەکان و ئەو هەوا گەرمەی بەهۆی هەناسەدانی ورچەکانەوە دروست دەبوو لە دەروازەی لانەکەوە دەچووە دەرەوە. هەوای گەرم لە ژوورەکاندا ناوەستێت، شوێنەکەی بۆ هەوای ساردی بەستێنەری جەمسەر جێ دەهێڵێت.

هەروەها ورچە جەمسەرییە دایکەکان سەری ئەو لانەیەی دروستی دەکەن بە بەفرێکی ئەستوور دادەپۆشن کە ئەستوورییەکی دەگاتە یەک مەتر. بەفر دابڕێنەرێکی زۆر باشە. واتە: بە ڕێژەیەکی بەرچاو ڕێگری لە ئاڵوگۆڕی گەرمی دەکات.

تەنانەت ئەگەر پلەی گەرما لە دەرەوە ۳۰-٤۰ پلە لە ژێر پلە سەدی بێت، لە ناو لانەکەدا ۲-۳ پلەی سەدی دەبێت.




ئەم جیاوازیی پلەی گەرمییە، ڕێژەیەکی زۆرە. بەهای ئەمەش ئەو کەسانە دەیزانن کە پلەی گەرما لە دەرەوە ۱۰ پلەی سەدییە، بۆ ئەوەی پلەی گەرمای ناو خانووەکەیان کە لە چیمەنتۆ دروست کراوە و ڕووکاری دەرەوەی بە عەزلێک ڕووپۆش کراوە کە لە ۲٥ پلەی سەدیدا بهێڵێتەوە، هەموو مانگێک ناچارن پارەی گازی سروشتیی بدەن.

پلەی گەرمای ئەم لانانەی ورچە جەمسەرییەکان، تەنانەت لە وەرزی زستانیشدا هیچ ناگۆڕێت، ئەمە لە کاتێکدا جەمسەرەکان زۆر ساردن و لەو وەرزەشدا کەشوهەوا تیایدا بەستێنەرە.

ورچی جەمسەری دایـکە، بێچـووە بچووکەکـانی دەنێـت بە سنگە گەرمەکەیەوە و شیریان پێ دەدات، کاتێک وەرزی بەهـار دێت، بە بینینی خەوی خۆش بەسەری دەبات، وەک خەوبینـین بە سـەگی دەریـایی چەور کە ڕاویـان دەکـات. لەم مـاوەیەدا (نـزیکەی حەوت مانـگ) دایـکەکە هـیچ شـتێک نـاخوات. بێچووەکانیشی بەبەردەوامی لە گوانی دایکیانەوە شیر دەخـۆن. ورچە جەمســەرییە دایـکەکە چەوریـی جەسـتەی بـۆ پـرۆتین دەگۆڕێت و تێکەڵی شیرەکە دەبێت.

کاتێک بێچووەکان بەخێرایـی گەشـە دەکەن و گەورە دەبـن، دایکیان زۆر زۆر لاواز دەبێت.

لە دوای وەرزی زســـتان، کاتێــــک لە جەمســــەرەکاندا کەشوهەوا کەمێک گەرمتر دەبێت (کاتێک دەڵـێم گەرم دەبێـت، بەو شێوەیە تێمەگەن زۆر گەرم، چونکە هێشـتا پلەکـانی گەرمـا تیایدا نازانم چەند پلە ژێر سـفری سـەدیە) و ورچە جەمسـەرییە دایـکەکە، بـۆ یەکەم جـار بێچووەکـانی کە تووکیـان کـردووە و چاویـان کـراوەتەوە و بە خـواردنی شـیری دایکیـان گۆشـتن و چەور بوون، دەباتە بەر تیشکی خۆر.

هەمووان پێکەوە گەشتێک بە جەمسـەرە بەریـنەکەدا دەکەن. ورچە دایکەکە، بێچووەکانی فێـری ڕاوکردنـی سـەگی دەریـا و ماسـیگرتن بەبـێ قـوولاپ و دروسـتکردنی حەڵـوای بەفـر و

ترساندنی ئەو پشکنەرە نامۆیانەی سەردانی ناوچەی جەمسەری دەکەن، دەکات.

یەکێــک لە چیرۆکەکــانی ســاردترین شــوێنی جیهــان و گەرمترین شوێنی جیهان، بەم شێوەیە.

لەم نێوەندەدا، دەزانم کە ناختان پڕە، لەبەر ئەوە با ئەوەشــتان پێ بڵێم:

خەم مەخـــــــۆن، ورچە جەمســــــــەرییەکان دەرک بە بەرزبــوونەوەی هەوای گەرم نــاکەن. دروســتکردنی لانەکانیــان بەو شێوەیە، تایبەتمەنــدییەکە لەلایەن بەدیهێنەرەکەیــانەوە پێیــان بەخشــراوە. هەروەک هەنگەکــان چــۆن ئەو شــانە هەنگــوینییە شەشــپاڵووە نایــابە بێکەموکــووڕییە لە شــانەکانیاندا دروســت دەکەن، هەروەها چۆن جاڵجاڵۆکەکان تۆڕەکانیان دەچنن.



# شیرپێدان لە ژێر ئاودا



وەک بیستوومە، ئەم ساڵ لە تاقیکردنەوەکانـدا پرسـیارێکی سەرسوڕهێنەری لەم شێوەیە هاتووەتەوە:

**لەم ئاژەڵانەی خوارەوە کامیان بێچووی دەبێت و شـیری پـێ دەدات؟**

ا- بۆق　　　ب- پەنگوین　　　ت- دۆلفین

پ- تیمساح　　　ج- حاجی لەقلەق

لە سەردەمی ئێمەدا پرسیاری بەم شێوەیە ئاسان نەدەهـاتەوە. ئەگەر بهاتـایەوە، ئەوا بێگومـان منـیش لە بەشـی "پاسـەوانی دارسـتان" کە دوو سـاڵە و زۆر حەزم لێـی بـوو، وەردەگیـرام! هەروەها لە دەفتەری وەڵامدانەوەکەدا بۆ ئەوەی بەتـاڵ نەبێـت و نەبێـتە مـایەی شـەرمەزاری، خـڕ خـڕ هەوڵـی کێشـانی وێـنەی سێبەریی میرکاتێکم نەدەدا، کە هەر لە هەڵاتنـی خـۆرەوە خـۆی دەداتە بەر تیشکی خۆر.

هەر لە دوای تـاقیکردنەوەکە، پـاش مـاوەیەک لە ئەنجـامی بەدواداچـــوونێکی کورتـــدا کە لە ئینتەرنێـــت ئەنجـــامم دا، تێبینییەکی لەم شێوەیەم بەرچاوکەوت کە نووسرابوو:

"ئـێ چـی دەبێـت، ئەگەر بڵـێن وەڵامە ڕاسـتەکە حـاجی لەقلەقە!"

ڕووی دەمم دەکەمە ئەو حـاجی لەقـلەقەی پـێش سـاڵانێک ئەم خانمەمانی بۆ دایک و بـاوکی هێنـاوە و پێـی دەڵـێم: "وەرە ئەمە ببەرەوە! ئەمە زیادە لە خۆڕا ئۆکسجین بەکار دەهێنێت!"

## شیرپێدان لە ژێر ئاودا

ئەگەر نەزانـن نەهەنگەکـان و دۆلفینەکـان ماسـی نـین و لە گیانداری شیردەرن و لە ئاودا دەژیـن، ئەوا قورسـە وەڵامـی ئەم پرسـیارە بـدەنەوە. هەروەهـا ئەگەر یەکێـک لە بژاردەکـان **هیچکامیـان** بـووایە، ئەوا بە ئەگەرێکـی زۆرەوە خێـرا ئەو وەڵامەتـان هەڵـدەبژارد. بەم شـێوەیەش وەڵامێکـی هەڵەی دیکەتان دەبوو.

بەهۆی ئەوەی هیچ کام لە بژاردەکان **هیچکامیـان** نیـیە، دوو ئەگەر دەمێنێتەوە.

یان بە بەتاڵی جێهێشتن، یاخود سەرت دەلەقێنـی و دەڵێیـت ئەی ئەگەر گرتی. ئێستا خودا دەزانێـت تیمسـاحە یـان حـاجی

لەقلەق! بێگومـان لەم حـاڵەتەدا لەوانەیە یەکێـک لە ئاسـانترین پرسیارەکانی تاقیکردنەوەکەت بەفیڕۆ بچێت.

بەڵـێ، دۆلفینەکـان شـیردەرن و نەهەنگەکـانیش هەروا. لە ڕاستییدا هەردووکیان ماسی نـین. ئەوانەی کـاتی خـۆی کتێبـی (**ماسـییەکان**)یـان خوێنـدووەتەوە، وەک نـاوی خـۆم دڵنیـام کە هەرگیز وەڵامی ئەم پرسیارە لە دەستیان دەرناچێت.

زیندەوەرێک شیردەر بێت، واتە: بێچووی دەبێت. هەروەهـا پێویستە بۆ ماوەیەکی زۆر شیری پێ بدات. لە کاتێکدا تەنـانەت هێنانەدونیای بێچوویەک و شیرپێدانی لەسەر وشکانی ئەوەنـدە ئاسان نیـیە؛ ئەی ئەو کـارە هەسـتیارە، لە نـاو دەریـادا چـۆن بە ئەنجام دەگات؟

دۆلفینەکان کە لە بەدیهێنانیـانەوە خـاوەنی ڕوخسـارێکی دەم بە پێکەنینن و بەوەش جیهانی دەریاکانیـان ڕازانـدووەتەوە، لەگەڵ نەهەنگەکانــدا کە گەورەتــرین شـــیردەرەکانی ئەم هەســارەیەن، چۆن لە ناو ئاودا بێچوویان دەبێت و چۆن شیریان پێ دەدەن؟

بۆچی بێچووە دۆلفینەکان، یـان بێچـووە نەهەنگەکـان کە لە ناو ئاوی سوێردا چاو بە دونیادا هەڵدەهێنن، ناخنکێن؟ چۆن لە کاتی شیرپێدانیاندا، لە ژێـر ئـاوەدا شـیرەکە دەخـۆن بـێ ئەوەی تێکەڵ بە ئاوەکە ببێت؟

# دۆلفینێک لە دایک دەبێت!

هەناسەدان بۆ مرۆڤەکان و هەموو ئەو بوونەوەرانەی لە وشکانیدا دەژین کارێکی خۆنەویست و بێ بیرکردنەوەیە. واتە: هەناسەوەرگرتن و هەناسەدانەوە، وەک بەڕێدا ڕۆیشتن و ڕاکردن و بەرزکردنەوەی دەست و قاچەکانمان، یان نانخواردن کارێک نییە پێشتر بیری لێ بکەینەوە. هیچ کامێکمان کاتێک هەناسە دەدەین نالێین: "با هەناسەیەک وەربگرم! ئەها هەناسەم وەرگرت بۆنی وەک میسک وایە. با ئێستا ئەو هەناسەیەی بدەمەوە کە وەرمگرتووە! هوو! ئەها هەناسەکەم دەرکردەوە. با ئێستا جارێکی دیکە لە لووتەوە وەریبگرم. ئای ئەو بۆنە چییە؟ ئای خودایە! ڕووەکی هەنگوینەکە گوڵی دەرکردووە!" بەڵام لە



دۆلفینەکانـــدا دۆخەکە جیـــاوازە. ئەوان کاتێـــک پێویســـتیان بە هەناسەدان دەبێت، ســـەرەتا بڕیـــاری لەســـەر دەدەن و پاشـــان لە ڕێگەی کونێک کە لەسەر ســـەریاندایە کە چـــوونە ســـەر ڕووی ئاوەکە هەناسەی پێ دەدەن.

کاتێک مرۆڤێک هەناسە دەدات، سییەکانی ١٥%ی پڕ دەبـــن لە هەوا.

بەڵام کاتێـــک دۆلفینێـــک هەناســـە دەدات، ئەو ڕێـــژەیە بە نزیکەیی ٨٠%یە. لەبەر ئەوە دەتوانێت مـــاوەیەکی زۆر درێژتـــر لە ژێـــر ئـــاودا بمێنـــنەوە، بەڵام وەک ماســـییەکان نـــاتوانن بە بەردەوامی لە ژێر ئاودا بمێننەوە.

ئەو گیانـــدارە شـــیردەرانەی لە وشـــکانیدا دەژیـــن، کاتێـــک بێچوویـــان دەبێـــت- ئەگەر دۆخێکـــی نەخـــوازراو نەبێـــت- بێچووەکـــان یەکەم جـــار ســـەریان لە ڕەحمـــی دایکیـــانەوە دێـــتە دەرەوە، چـــونکە پێویســـتە کـــۆرپەکە بەبـــێ دواکەوتـــن هەناســـە بدات، ئەگەر سەرەتا قاچەکانی بێتە دەرەوە، لە میـــانی پرۆســـەی لەدایکبوونەکەدا کە ماوەیەکی زۆری پێ دەچێت، کـــۆرپەکە بـــێ هەوا دەمێنێتەوە.

بەپێچەوانەوە، دۆلفینەکان کە لە ژێر ئاودا بێچوویان دەبێـــت، سەرەتا کلکی بێچووەکانیان دێتە دەرەوە و بەو شـــێوەیە لە دایـــک

دەبن. بەو هۆیەشەوە تا تەواوبـوونی پرۆسـەی لەدایکبـوونەکە، بێچووە دۆلفینەکە بێ هەوا نامێنێتەوە و ناخنکێت.

کاتێکیش پرۆسەی لەدایکبوونەکە تەواو دەبێت و بێچـووەکە سـەری دێنێـتە دەر، خێـرا دەبـرێتە سـەر ڕووی ئـاوەکە. لەم نێوەندەدا، دۆلفینەکانی دیکە هاوکاریی دۆلفینـی دایـک دەکەن. هەر وەک مامانێک تـا تەواوبـوونی پرۆسـەی لەدایکبـوونەکە و بردنە سەرەوەی بێچووەکە بۆ سەر ڕووی ئاوەکە، دایـکەکە جـێ نـاهێڵن. مـانەوەی ئەو دۆلفیـنە مامانـانە لە کـاتی پرۆسـەی لەدایکبـوونەکەدا لە دەوری دۆلفینـی دایـک سـوودێکی زۆر گرنگی دیـکەی هەیە؛ بە لـووتە نوکـدارە تیژەکانیـان قرشـەکانی دەوروبەر پاڵ دەنێن و دەریاندەکەن! چونکە بۆنی ئەو خـوێنەی لە کاتی لەدایکبوونەکەدا تێکەڵ بە ئـاوەکە دەبێـت، لە دووریـی چەندین کیلۆمەترەوە لەلایەن قرشەکانەوە هەستی پێ دەکرێـت، بۆیە ئەگەر مامانەکان نەبن، ئەوا بێچووەکە کە هێشتا چاوەکـانی نەکـردووەتەوە، خـۆی لەنـاو دەمـی قرشـێکی گەورەی سـپیدا دەبینێـتەوە کە پـڕە لە ددانـی تیـژی وەک گـوێزان، دایـکە بێچارەکەشـی ناتوانێـت بەو مانـدووییە نە خـۆی، نە بێچووەکەشی بپارێزێت.

بێچـووه دۆلفیـنه‌که‌، که‌ خێـرا ده‌بـرێته‌ سـه‌ر ڕووی ئـاوه‌که‌، دوای ئه‌وه‌ی به‌ قـوولّی یه‌که‌م هه‌ناسـه‌ی دا، به‌ یـاوه‌ری دایـکه‌ شیرینه‌که‌ی و مامانه‌کانی ده‌ست به‌ مه‌له‌کردن ده‌کات.

دۆلفینه‌کان وه‌ک شـیرده‌ره‌کانی دیـکه‌ پێکهـاته‌ی ده‌میـان به‌ شێوه‌یه‌ک نییه‌ که‌ بتوانن مه‌مکی دایکیان بمـژن و شـیر بخـۆن، واته‌: لێویان نیـیه‌. هه‌روه‌هـا دۆلفیـنه‌ دایکه‌کـانیش وه‌ک مانگـا گوانی خڕ و قه‌لّه‌ویان نییه‌. له‌بری گـوان له‌ سـکی دۆلفیـنه‌که‌دا دوو درز هه‌یه‌. هه‌ر که‌ بێچـووه‌ دۆلفیـنه‌که‌ به‌ لـووتی پـالّی به‌و درزانه‌وه‌ نـا، شـیره‌که‌ دێـته‌ ده‌ره‌وه‌. ئه‌م شـیره‌ زۆر چه‌وره‌. له‌ کاتێکدا شیری مانگا ١٥%ی چه‌وریه‌، شـیری دۆلفـین ٥٠%ی چه‌وریه‌. ئه‌م شـیره‌ چه‌وره‌ زۆر گـرنگه‌ بـۆ ئه‌وه‌ی بێچـووه‌ دۆلفینه‌که‌ له‌ ماوه‌یه‌کی کورتـدا کێشـی زیـاد بکـات و چینێکـی پێویسـتی چه‌وری تێـدا دروسـت بێـت بـۆ ئه‌وه‌ی له‌نـاو ئـاوه‌ سارده‌که‌دا سه‌رمای نه‌بێت. هه‌روه‌ها شیرێکی ئه‌وه‌نـده‌ چه‌ور و خه‌سته‌ (وه‌ک مه‌حه‌له‌بی)، بـێ ئه‌وه‌ی له‌گه‌لّ ئـاوی ده‌ریـاکه‌دا تێکه‌لّ ببێت، ڕاسته‌وخۆ ده‌چێته‌ ده‌می بێچووه‌که‌وه‌.

دۆلفینه‌کان دایکانی زۆر باشـن. له‌گه‌لّ دۆلفینه‌کـانی دیـکه‌ که‌ پوور و خالّیانن به‌خێوکردن و ڕاهێنـانی بێچووه‌کـان ده‌گـرنه‌ ئه‌ستۆ. به‌م سیستمه‌ نائاسـاییه‌ تـایبه‌ته‌ی خۆیـان، له‌ مـاوه‌یه‌کی

کورتــدا بەخێرایــی فێــری مەلەکــردن و چــوونە قــووڵایی و ڕاوکردنی دەکەن.

ڕەنگە هەنـدێك لە بێچووەکـان لە چـوونە قـووڵایی ئـاوەکە شەرم بکەن. لەم دۆخەشدا، دایکەکە و دۆلفینەکـانی دیـکە پـاڵ بە بێچووەکەوە دەنێن بـۆ ئەوەی ناچاریـان بـکەن لە ژێـر چەنـد مەترێکەوە مەلە بکەن.





## گەورەترین بێچووی جیهان

کاتێــک دایکـــان بــۆ یەکەم جــار منــداڵەکانیان دەهێنـــنە دونیــاوە، زۆر پێیــان خۆشــە خــرپن بــن. بێگومــان ئەوە بــۆ دایکانێـــک دەبێـــت کە منـــداڵێکی لەو شـــێوەیە دەهێنێـــتە دونیاوە.

ئەگینــا هەنــدێك منــداڵ، لەوە لاوازتــرە کە پێویســتە بەو شـــێوەیە بێــت، ئەوانەشـــی پێشـــوەختە لەدایــک دەبـــن، زۆر زۆر بەلاوازی دێــنە دونیــاوە. بەڵام دایــک نــابێتە پێشــەنگ لە هێنـــانە دونیـــای منـــداڵی خـــرپن. بێگومـــان گەورەتـــرین شـــیردەری ســـەر گـــۆی زەوی نەهەنـــگە شـــینەکانن. نەهەنگێکـــی شـــین کاتێـــک بێچـــووی دەبێـــت، کێشـــی ســـێ تەن و درێژییەکەی حەوت مەترە!

ئـــاخر! خــۆ ئەگەر ئێــوەش دایکتـــان کێشـــی ١٥٠ تەن بـــووایە و درێـــژییەکەی ٣٠ مەتـــر بـــووایە، ئەوا کاتێـــک دەهـــاتنە دونیـــاوە کێشـــتان ٢,٥ کیلـــۆ و باڵاتـــان ٤٧ سانتیمەتر نەدەبوو، ئەی وا نییە؟

وەک هەمـــوو دایکـــان، ئەو دڵە گەورەیەی نەهەنگـــی شـــینیش کە ٦٠٠ کیلـۆیە بەرانـبەر بێچـووە بچـووکەکەی تـا لێواری پڕە لە بەزەیی و میهرەبانیی!

نەهەنـــگە شـــینەکان زۆر گرنگـــی بە بێچووەکانیـــان دەدەن. بـۆ مـاوەی ١٩ مانـگ لە سـکیاندا هەڵیانـدەگرن، کە ئەوەش یەکـێکە لە مـاوە درێژەکـانی دووگیـانی لە جیهانـدا. (زەڕافە ١٤-١٥ مانـگ، شـێری دەریـا ١٥-١٦ مانـگ، فیـل ٢٤ مانـــگ، قرشـــەکان ٢-٣ ســـاڵ) مـــاوەی دووگیـــانیی دایکـــی مـــرۆڤ وەک دەزانـــن نـــۆ مـــانگە. واتە: بێچـوویەکی نەهەنگـی شـین ١٠ مانـگ زیـاتر لە ئـێمە لە سـکی دایکیـدا دەمێنێتەوە.

نەهەنــگە شــینەکانیش هەروەک دۆلفینەکــان بە شــیرێکی زۆر چەور و خەســـت (خەســـتییەکی وەک هەویـــری ددان) بێچووەکانیـــان بەخێـــو دەکەن، بەڵام ئەم خۆراکپێـــدانەیان کەمێـک زیـاترە، چـونکە نەهەنگـی سـاوا لە ڕۆژێکـدا ٣٠٠-٥٠٠ لیـــتر، واتە: نـــزیکەی نیـــو تەن شـــیر دەخـــواتەوە و

بەخێرایـــی گەورە دەبێـــت، بە شـــێوەیەک ڕۆژانە ٩٠ کیلـــۆ لە کێشـــی زیـــاد دەکـــات! باڵاشـــی لە ڕۆژێکـــدا ٤-٥ ســـانتیمەتر درێـــژ دەبێـــت. بەم شـــێوەیە نەهەنگـــی شـــین بەدرێژایـــی ٧-٨ مانـگ بێچـووە بچـووکەکەی بەخێـو دەکـات و خـواردنی پـێ دەدات، مـــاوەیەکی زۆریـــش لەگەڵیـــدا دەمێنێـــتەوە و جێـــی ناهێڵێـــت. لە زەریـــا بەرینەکـــانی هەســـارەکەماندا، کاتێـــك بـــاس لە دڵـــی نەهەنگـــی شـــین دەکرێـــت کە بە هێنـــدەی بارهەڵگرێـــک گەورەیە، بە لەدایکبـــوونی بێچـــووەکەی وەک دڵـی چـۆلەکەیەکی بچـووکی لـێ دێـت کە بە هێمنـی لەســەر هێلکەکانی کڕ کەوتووە و بەپەلە لێ دەدات.

# وەك شیری دایك حەڵاڵە!



گۆلکێکی بچووک، بەوە زۆر زۆر توورە دەبێت کە هەموو ئێوارەیەک کچۆڵەیەکی دەموچاو پەڵاوی بە یەک دوو تەنەکەی بەتاڵی گەورەوە تەقە تەق بێت و گوانەکانی دایکی بدۆشێت و یەک دڵۆپ لەو شیرەی زۆر حەزی لێیەتی بۆی نەهێڵێتەوە و تەنەکەکانی لێ پڕ بکات و بیباتەوە بۆماڵەوە.

هەر باشە بەس توورە بێت، ئەگەر ئیرەییشی پێ نەبات!

ڕۆژێک گۆلکەکە سەری لە سکە گەورەکەی دایکی ژەنی و پێی وت: "دایکە گیان، بۆچی دەبێت ئێمە باجی ئەو مرۆڤە چاوبرسیانە بدەین؟ با هەڵبێین و لێرە ڕابکەین؟"

مانگا دایکەکە دوای ئەوەی بە دەم جوینی گیاکەی ناو دەمی و قووتدانی ئاوڕی بۆ دایەوە، بە چاوە گەورەکانی تەماشایەکی کرد و وتی: "زۆر شوورەییە! قسەکردنی لەو شێوەیەم دەربارەی خوشک و برا شیرییەکانت پێ خۆش نییە!"

دەستخۆشی لەو هەڵوێستە جوانەی مانگا دایکەکە دەکەم، بەڵام گۆلکەکەش بەتەواوی هەڵە نییە! چونکە لەناو هەموو شیردەرەکاندا، تەنیا مرۆڤەکانن بەدرێژایی

تەمەنیــان واز لە شــیرخواردنەوە نــاهێنن. بێگومــان بــاس لە شــیری دایــک نــاکەم، تەنــانەت بیرکــردنەوەش لێــی ســەیر و نامۆیە!

دایکـــانی مـــرۆڤ، لانـــی زۆر تـــا دوو ســـاڵ شـــیر بە کۆرپەکانیــان دەدەن. بێگومــان هەیشــە دەڵێــت: "کــێ ئێســتا تــاقەتی هەیە بە قــاپ و کەوچــک و مەنــجەڵ و چەتــاڵەوە ســەرقاڵ بێــت، هەر بەم شــێوەیە باشــە! هەروەهــا کێشــەی ئەوەشــم نیــیە پــێم بڵــێن: 'نــانەکەت تەواو بــکە!'، 'ئــاخر مانــای چیــیە دەڵێیــت تــامەکەیم بە دڵ نیــیە؟' " بــۆیە بە گــری گــری مــاوەکە تــا ســێ ســاڵ درێــژ دەکەنەوە. خــوا ڕەحمــی کـــــردووە بەوەی کۆرپەکـــــان بێئاگـــــان لەوەی ئەو ڕۆژانە خەریــکە کۆتــایی دێــت کە لە نــاوکی دایکیــانەوە خۆراکیــان پــێ دەدرا، ئەگینــا دەیــانوت: "تکــایە نــاوکم مەبــڕن. مــن لەســکی دایە گیانمــدا کێشــەم نیــیە بــۆ خــۆم دەژیــم!" و دەرنەدەچــوون. هەرچەنــدە هەنــدێک لە منــداڵەکان ئەوەی لەدەســتیان بێــت ئەنجــامی دەدەن بــۆ ئەوەی لەدایــک نەبــن، بەڵام هەوڵەکانیان بێ ئەنجامە.

دوو ســاڵ تــا ســێ ســاڵ، لە کۆتاییــدا خزمەتگــوزاری شــیری دایــک تەواو دەبێــت و وردە وردە دەســت دەکەیــن بەتامکردنی نیعمەتە بەتامەکانی دیکەی سەر زەوی.

بۆ نموونە وەک چی؟ وەک شۆربای شیڤەیدیز!

بەڵێ بەدڵنیاییەوە شیڤەیدیز! (خواردنێکی پارێزگای عەنتابە کە لە سیر و گۆشتی بەرخ دروست دەکرێت) جا ئەوە ئەگەر ڕۆنەکەرەی بەسەردا بکرێت و زەنجەفیلی تێ بکرێت (نەعنای وشکیش دەبێت) قاپێکی گەورەی مسی شیڤەیدیز! بۆ واتان دەزانی دەڵێم شەربەتی شلیک؟

بەڵام هەرچییەک بخۆین، بە شێوەیەک لە شێوەکان لەسەر خواردنەوەی شیریش هەر بەردەوام دەبین. بێگومان ئیتر شیری مانگا بێت! یان شیری بزن و حوشتر و لاما! بەڵام بەسوودترین و بەتامترین و تەندروستترین شیر کە بەدرێژایی تەمەنمان بە گەروومانددا چووەتە خوارەوە و هەردەم تازەیە و زۆرترین پێویستمان پێیەتی و بەدڵنیاییەوە حەڵاڵترین خۆراکە کە هەرچەندە ڕەنگە ئێستا تامەکەیمان بیر نەمابێت؛ شیری دایکە، چونکە ئەوە تایبەتە بە ئێمە.



هەروەک چـــۆن ئەو میهرەبـــانییەی لە دڵـــی دایکانمانـــدا ئامـادە کـراوە، پـێش ئەوەی ئـێمە لەدایـک بـین، چەرخەکـانی ئەو دوو کـــارگە شـــیرەی لەســـەر ئەو دڵە میهرەبانەیـــدا هەن، موعجیزەئاسا دەکەونە کار.

ئەو خۆراک و ئاوەی دایـکەکە دەیخـوات، بە سیسـتمەکانی ئەم ناوەندی بەرهەمهێنانەدا تێدەپەڕێت و دەگۆڕێـت بـۆ شـیری موعجیزەئاسای دایک، کە پێویسـتترین شـتە بـۆ ئەو کـۆرپەیەی بەم نزیکانەدا دێتە دونیاوە.

لەم جیهـانەدا تەنیـا یەک شـت هەیە کە بـۆ کـۆرپەیەک لەوە بەتامترە؛ ئەویش ئەو کاتەیە کە کۆرپە لەسەر سنگی دایکێتی بـۆ شیرخواردن و گوێ لە ترپەی میهرەبانیی دڵی پڕ بەزەیی دایکـی دەگرێـت کە هەر ئەمە دەڵێـتەوە: "ڕۆڵە شـیرینەکەم، ڕۆڵەکەم"، بەم شێوەیەش خەو دەیباتەوە و دەچێتە خەوێکی قووڵەوە.

# کارەساتی گەورەی شیری وشک

لە کۆتــایی ســاڵانی ١٩٧٠ کانــدا، یەکێــک لەو کۆمپانیــا بەناوبانگانەی جیهان کە بنێشت و خــۆراکی منــداڵان و شــیری وشک بەرهەم دەهێنێت، فێڵبازانە هەستا بە ئەنجامدانی کارێـک بۆ فرۆشتنی بەرهەمەکانی لە زۆر وڵاتی ئەفریقادا، بەتـایبەتی لە ئەفریقای خۆرئاوا و پەیداکردنی پارەیەکی زۆر زیاتر.

حساباتی ئەوەیــان کردبــوو کە ئەگەر دایکــان واز لە پێــدانی شیری خۆیان بهێنن بە منـداڵەکانیان و ئەم شــیرە وشــکەیان بــۆ بگــرنەوە و دەرخواردیــان بــدەن، پــارەیەکی زۆر سەرســوڕهێنەر قــازانج دەکەن، بەڵام پێویســتبوو دایکــان هانبــدرێن بــۆ ئەوەی ڕایانبهێنن لەسەر بەکارهێنانی شیری وشک. بۆ ئەم مەبەستەش، کۆمپانیاکە هەستا بە دابەشکردنی دەیان تەن شیری وشک بەبــێ بەرانبەر.

لەبەر ئەوەی ئەم شــیرە هەم کارئاســانی بــوو بــۆ دایکــان، هەمــیش پێیــان وترابــوو کە تەندروســترە، ســەریان کــردە ســەر بەکارهێنانی ئەم شیرە وشکە بەلاشە.

لەبەر ئەوەی وازیــان لە پێــدانی شــیری خۆیــان هێنــا بە منداڵەکانیان، زۆربەیان دوای ماوەیەک شیریان کەمی کــرد یــان

بەتەواوی وشکی کرد و نەما. بەو هۆیەشەوە هەموو سەریان کردە سەر بەکارهێنانی ئەو شیرە.

لە ڕاستییدا ئەوەش خواستی کۆمپانیای شیری وشک و خواردنی ئامادەکراو بوو. دابەشکردنی شیری وشکیان کەم کردەوە و وتیان: "ئەوەی زیاتری دەوێت، دەبێت بیکڕێت!"

بەڵام خەڵکەکە ئەوەندە هەژار بوون کە نەیاندەتوانی بە پارە بڕی پێویستی شیری وشک بکڕن. لەبەر ئەوە هەزاران منداڵ تووشی بەدخۆراکی بوون. زۆربەیان نەخۆش کەوتن و گیانیان لەدەست دا.

لەوە ترسناکتر، لەبەر ئەوەی ئاوی پاک و بێ میکرۆبیان دەست نەدەکەوت، شیرە وشکەکەیان بە ئاوی پیس دەگرتەوە و دەرخواردی منداڵەکانیان دەدا. بەو هۆیەوە پەتا لە نێو منداڵاندا بڵاو بووەوە و دوای ماوەیەک پەتاکە بە وڵاتدا تەشەنەی سەند، کە گیانلەدەستدانی سەدان هەزار منداڵی لێکەوتەوە.

خۆ لە هەمان کاتدا ئەو منداڵانەی تەنیا بە شیری دایک بەخێو دەکران، زۆربەیان هیچ شتێکیان بەسەردا نەدەهات.

لە کۆتاییدا، ئەو کۆمپانیا بەناوبانگە، لەلایەن زۆرێک لە وڵاتانەوە بایکۆت کرا.

ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO)، بڵاوی کردەوە کە پێویستە منداڵان لە شەش مانگی یەکەمی تەمەنیاندا تەنیا

شـیری دایکیـان پـێ بـدرێت. هەروەهـا ڕایگەیانـد کە هـیچ خواردنێکی ئامادەکراو و شیرێکی وشک شوێنی شـیری دایـک نـــــاگرێتەوە، لەبەر ئەوە قەدەغەی کــــرد ئەو کۆمپانیـــــا بەرهەمهێنەرانەی خۆراکی لەم شـێوە نامۆیـانە دروسـت دەکەن، ڕیکلامی: "وەک شیری دایکە" و چالاکی ناساندنی بۆ بـکەن و بە بەلاش بەسەر خەڵکیدا دابەشی بـکەن. هەمـوو وڵاتەکـان بە کـۆی دەنـگ ئەو یاسـایەیان پەسـەند کـرد. تەنیـا ئەمـریکییە چاوبرسییەکان ناڕازی بوون!

## بۆچی شیری دایک ئەوەندە گرنگە؟

لەو ڕۆژەوەی کە یەکەم ئـافرەتی سـەر گـۆی زەوی (دایـکە حەووا)، یەکەم منـداڵی هێنـایە دونیـاوە و لە باوەشـی گـرت، ئەگەر دایکان و منـداڵان باسیشـی نەکەن، بـاش دەزانرێـت کە شیری دایک چەنـدە نیعمەتێکـی گەورەیە. تەنـانەت باوکـانیش دەرک بەوە دەکەن کاتێک دەڵێن: "ئۆخەی! لانی کەم بۆ مـاوەی شەش مانگ بابەتی خۆراک چارەسەر بوو. هەر ئەوەنـدە بەسـە بەباشـی ئاگـاداری دایـکەکە بـین!"، چـونکە منـداڵانی تـازە لەدایکبـوو، لە شـەش مـانگی سـەرەتادا هـیچ پێویسـتیان بە

خۆراکی تەواوکەر نییە، تەنانەت ئاویش، لەبەر ئەوە دەتوانن تەنیا بە شیری دایک بەئاسانی تێر ببن.

هەموو ئەو خۆراکانەی منداڵێک پێویستی پێیەتی، لە ناو شیری دایکدا بەپێی پێویست بوونیان هەیە. لەوانەیە کەمێک ڤیتامین دی پێویست بێت، بەتایبەتی بۆ ئەو منداڵانەی لە ناو چوارچێوەی دیواری شووقەدا گەورە دەکرێن، ئەویش لەبەر ئەوەی تیشکی خۆر لێیان نادات.

شیری دایک تایبەتە، بەڵام بەڕاستی تایبەتە، چونکە بۆ هەر منداڵێک بەتایبەتی بەدیهێنراوە.

کۆمەڵێک ماددەی بەسوودی تێدایە، کە لە شیری مانگادا نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، ناتوانرێت ئەو ماددانە لە تاقیگە و کارگەکاندا بەرهەم بهێنرێت. لەبەر ئەوە خواردنی ئامادەکراوی منداڵ لە پاڵ شیری دایکدا هیچ بەهایەکی وای نییە.

دایکانی ژیر زۆر باش ئەمە دەزانن و ناچار نەبن (هەندێك جار شیری دایک کەمە، یان هەر نییە) هەرگیز لە شەش مانگی یەکەمی تەمەنیدا ئەو گیراوانە بە کۆرپەکانیان نادەن.

ئەو منداڵانەی خوشک/برایەکی تازەیان لەدایک دەبێت، هەردەم ئەم سەرکێشییانە بە خەیاڵیاندا دێت کە دەڵێن:

دوای چوار پێنج ساڵی دیکە، لەگەڵ خوشک/براکەتدا بەیەکەوە دەچنە کارتۆنێکی گەورەوە و بە نێو ئەستێرەکاندا گەشت دەکەن!




ئەوە بیرۆکە نایابەکەیە! چونکە کەس نایەوێت بە تەنیا گەشتی نێوان ئەستێرەکان ئەنجام بدات! هەروەها تەنیا خوشک/برا بچووکەکان باوەڕ بەوە دەکەن بچنە ناو کارتۆنێکی گەورەوە و گەشت بە نێو ئەستێرەکاندا بکەن!

بەڵێ، باسی چیم دەکرد؟ ئەها! هەر منداڵێک خوشک/برایەکی تازە لەدایکبووی هەبێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە ئەو بیرۆکە شێتانەیەی بە خەیاڵدا دێت:

"سەیری ئەوە، چۆن بەهەڵپە شیر دەخوات. سەردەمانێک منیش بەو جۆرە بووم، بەڵام ئێستا تامەکەیم بیر نەماوە. بێگومان دەبێت زۆر بەتام بێت! ئایا ئەگەر بە دایکم بڵێم تۆ

بڵێی تۆزێکم بەش بـدات، چـۆن دەبێـت؟ تامەکەشـی دەکەم، زۆر حەزم لێیە زۆر!"

لەخۆوە خەم مەخۆن. ئەگەر بەو حاڵەتانەوە کە گەورە بـوون لاسـایی خوشـک/براکەتـان بـکەنەوە و تـامی شـیری دایکتـان بکەن، ئەوا بەدڵنیاییەوە بەدڵتان نابێت.



- وەی! ئەوە بۆ وایە! دەڕشێمەوە!

- وست! نابێت لەلای خوشک/براکەت وا بڵێیت.

- بەڵام ئەوە زۆر قێزەونە!

- شوورەییە. من چیم بەسەر نەهات تا لە شیرم بـڕیتەوە. سـێ مانگ زیاتر لە کاتی خۆت شیری منت خوارد.

- بەڵام دایکە ئەوە شتێکی قێزەونە!

- بێگومان ئێستا وایە!

- من پێم باشە شۆربای سپێناخ بخۆم.

- کەری چ داماوێك تۆپیوە؟ ئێوارە شۆربای سـپێناخمان هەیە، باشە!

- بە ڕای من، کەمێ شۆکۆلاتە بخۆ؛ لەوانەیە تـامی شـیرەکە لە دەمتدا بگۆڕێت. شۆکۆلاتەی شیریش دەبێت!

- ئاھ نا نا! ئەمە وا نابێت.

تەنـانەت ئەگەر هـی خوشـک یـان براشـتان بێـت، کاتێـک هەوڵ بدەن شیری دایکتان بخۆنەوە، ئەمە ڕوو دەدات.

چـــونکە شـــیری دایـــک تەنیـــا و تەنیـــا بـــۆ ئەو کـــۆرپەیە بەدیهێنراوە.

شـــیری دایـــک بەو تـــام و خەســـتی و ڕێـــژەی پێکهـــاتە جیاوازەکانیەوە، بە هیچ شێوەیەک لە شـیری مانگـا و ئەو شـیرە پوختەکراوانە ناچێت کە بە قوتوو لە مارکێتەکاندا دەفرۆشرێن.

ئێـــوەش ســـاڵانێک لەمەوبەر شـــیری هەمـــان مەمکتـــان خواردووە، بۆیە جیاوازیی نییە. ئەو شیرەی بۆ منـداڵێکی تەمەن پێنج مانگان دروست دەکرێت، لەگەڵ حەزی خوشک و بـرا دە ساڵانەکەیدا ناگونجێت!

شیری دایک بەپێی گەشە و گەورەبـوونی منـداڵەکە بەردەوام پێکهاتەکەی دەگۆڕێت. تەنانەت بەیانیان پێکهاتەکەی جـۆرێکە و ئێوارانیش جۆرێکی دیکەیە. دەتـوانین ئەمە بەراورد بکەیـن بە

جۆری خـوانی گەورەکـان لە بەیانیـان و ئێوارانـدا کە خـۆراکی جیاواز دەخۆین.

ئەو شیرەی کۆرپەیەکی یەک مانگی دەیخـواتەوە، لەگەڵ ئەو شـیرەی کـۆرپەیەکی پێـنج مانگـانە دەیخـواتەوە لە یەکـتری جیـاوازن، چـونکە کاتێـک کۆرپەکـان تەمەنیـان دەگـاتە پێـنج مانگی، پێویسـتیان بە خـۆراکی زۆر جیـاوازتر هەیە. کـاتێکیش پێویسـتییەکانی کـۆرپەکە دەگۆڕێـت، پێکهـاتەی شـیرەکەش دەگۆڕێت. ئەو دژەتەنانەی بۆ زیاد دەبێت کە بـۆ نەخۆشـییەکان باشن و لە ماوەیەکی کورتدا چاکیان دەکاتەوە.

## دوو ساڵی تەواو

سندووقی هاوکاریی منداڵانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان (UNICEF) و ڕێکخـراوی تەندروسـتی جیهـانی (WHO)، دەڵـێن: پێویسـتە منـداڵان هەر لە لەدایکبوونیـانەوە تـا شـەش مانگی یەکەمی تەمەنیان، تەنیا شیری دایکیان پێ بدرێت.

بێگومان ئەمە بە واتای ئەوە نایەت: "لە دوای شـەش مانـگ شیریان پێ مەدەن و لەفەی مریشک و گۆشتی برژاویـان بـدەنە دەسـت بـا بـۆ خۆیـان بیخـۆن". هەر بە پێـی ڕاپـۆرتی ئەو ڕێکخـراوانە، تەنـانەت ئەگەر کـۆرپەیەک دەسـتی بە خـواردنی

تەواوکەریــش کردبــوو، دەبێــت تــا دوو ســاڵ بەردەوام شــیری دایکی بخوات!

چونکە ئەم دوو ساڵە بۆ گەشەی منداڵەکە زۆر گرنگە.

ئایــا باســم لەوە کــردووە کە هەر بــابەتێکم لە کتێبەکــانی بەدیهێــنراوە سەرســوڕهێنەرەکاندا نووســیبێت، بە دوای ئەوەدا گەڕاوم کە تــۆ بڵێــی لە قورئانــدا ئایەتێــک هەبێــت لەســەر ئەو بابەتە؟

بەڵــێ زوو زوو ئەم گەڕانە دەکەم و کەمێــک پــێش ئێســتاش دووبارەم کردەوە، تەماشــا بــکەن چــیم دۆزیــیەوە، زۆر ســەرتان دەسوڕمێت:

"ئەو دایکانەی دوو ساڵی تەواو شیر دەدەن بە منــداڵەکانیان بۆ یەکێــک بیەوێــت مــاوەی شــیرپێدان تەواو بکــات." (البقــرة: ٢٣٣)



# باشترین زڕدایکی جیهان



هەر کەسێک ئەو چیرۆکە ترسێنەرانەی زڕدایکی نووسیبێت، بەخێر نەیەتەوە!

باشـــە، دەی بـــا وا بێـــت؛ بێگومـــان لە ژیـــانی ڕاســـتەقینەدا زڕدایکـــی خـــراپ و تەنـــانەت ترســـێنەر هەن. لەگەڵ ئەوەشـــدا، دایکی ڕاستەقینەی خراپ و تەنانەت ترسێنەریش هەن.

واتە: بـــوونە دایکێکـــی بـــاش، تەنیـــا پەیوەنـــدی بە دایکـــی ڕاستەقینە یـــان زڕدایـــکەوە نیـــیە؛ بـــوونە دایکێکـــی بـــاش، پـــێش هەموو شتێک پەیوەندی بە بوونە کەسێکی باشەوە هەیە.

ئەو ڕووداوەی کەمێکـــــی دیـــــکە بۆتـــــان بـــــاس دەکەم سەرسوڕهێنەرە، بەڕاستی زۆریـــش سەرســـوڕهێنەرە و پەیوەنـــدی بە باشترین زڕدایکی جیهانەوە هەیە! لە هەمان کاتدا، خـــراپترین دایکی ڕاستەقینەش!

بەڵام دڵتان خـــۆش مەکەن، چیرۆکـــی تیتـــیلە و بیبیلەتـــان بـــۆ نـــاگێڕمەوە، چـــونکە ڕووداوەکە لە جیهـــانی باڵندەکانـــدایە و ئەوانەشی هێلکە دەکەن باڵندەکانن.

# فێڵی باوەڕپێنەکراوی باڵندەی کوکو

لە ڕاستییدا ئەگەر لە چاوی باڵندەی کوکو خۆیەوە تەماشای ڕووداوەکە بکەین، ئەوا دەمانتوانی برێک ماف بە خۆی بدەین، چونکە ئەویش وەک هەموو دایکانی دیکە باشترین کار بۆ بێچووەکانی دەکات. لەگەڵ ئەوەی باشترین کار بۆ بێچووەکەی خۆی دەکات، بەڵام لەگەڵ بێچووی باڵندەکانی دیکە هیچ بەو شێوەیە نییە.

جۆرێک لە باڵندەی کوکو هەن کە وەک هەموو باڵندەکانی دیکە خۆی هێلانە دروست دەکات، باڵندەی ئەو هێلانەیە و دایکی بێچووەکانە، بەڵام بەشێکی زۆریان هیچ تاقەتی ئەم ئەرکەیان نییە و هەر کە کاتی هێلکەکردنی هات، وەک دزی چەقاوەسوو و ناحەز و دزێو، خۆی لە پشت لقی درەخت، قامیش، گیای گەڵا پانەوە حەشار دەدات و چاودێریی باڵندەکانی دیکە دەکات.

هەندێک جار ئەم چاودێریکردنە چەند هەفتەیەک دەخایەنێت، چونکە کوکو بە شوێن هێلانەیەکی گونجاودا دەگەڕێت، ئەویش نەک بۆ خۆی، بەڵکو بۆ هێلکە زۆر بەهادارەکەی.

له کۆتاییدا، ئەو هێلانەیە دەدۆزێتەوە کە بەدوایدا دەگەڕێت، کە دڵی گرتی، ماوەیەک چاوەڕێ دەکات تا خاوەنی هێلانەکە هێلکەی تێ دەکات.

لەوانەیە ئەم هێلانەیە هی قەلەباچکەیەک بێت، یان هی باڵندەیەکی قامیش یان فیسقەیەک بێت.

باڵندە فیسقەکە کە نازانێت لە شوێنێکی نزیکەوە بە شێوەیەکی نهێنیی و فێڵبازانە چاودێری دەکرێت، دوای ئەوەی لە دروستکردنی هێلانەکەی بووەوە و پاکی کردەوە، هێلکەکانی تێدا دادەنێت. وەک هەموو باڵندە ئاساییەکانی دیکە لەسەر هێلکەکانی کڕ دەکەوێت. هەموو ئامادەکارییەکی بۆ دەکات و خەیاڵی دایکایەتی دەهۆنێتەوە، بەڵام ئەویش ناو بە ناو بۆ دۆزینەوەی خۆراک و ئاوخواردنەوە دەفڕێت.

دوای ئەوەی باڵندەی فیسقە ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت هێلانەکەی جێ دەهێڵێت، دەرفەت بۆ باڵندەی کوکو دەرەخسێنێت، کە چەند هەفتەیەکە چاوەڕوانێتی. کوکووەکە بەخێرایی خۆی دەگەیەنێتە هێلانەکە و یەکەم کاری ئەوەیە یەکێک لە هێلکەکانی باڵندە فیسقەکە لە هێلانەکە هەڵبداتە خوارەوە، پاشان لە شوێنەکەیدا خۆی هێلکەیەک دەکات.

هەندێک لە باڵندەکان کاتێک بۆ هێلانەکانیان دەگەڕێنەوە، خێرا دەرک بەوە دەکەن کە شتانێک گۆڕاون، خێرا هێلکە نامۆکە



دەدۆزنەوە و لە هـێلانەکەوە فڕێـی دەدەنە خـوارەوە، بەوەش ڕزگاریـــان دەبێـــت، بەڵام کوکووەکـــان تایبەتمەنـــدییەکی سەرسوڕهێنەریان هەیە؛ بەگشتی لەسەر شێوەی هێلکەکانی ئەو باڵندەیەی هێلانەکەیان لێ زەوت کردوون، هـێلکە دەکەن! لەبەر ئەوە باڵندەی فیسقەش وەک زۆرێک لە باڵندە بەدبەختەکان، بـێ ئەوەی هەست بە هیچ شـتێک بکـات، بەردەوام دەبێـت لەسـەر ئەرکی دایکایەتی خۆی.

باڵنـــدەی کوکـــو، وەک ئەو دایکـــانە ناکـــات کە بە هەر هۆکارێک بێت کۆرپەکەیان لە حەوشەی مزگەوت جێ دەهـێڵن و بە بێـــدەنگی بـــێ ئەوەی کەس بیانبینێـــت، بەدزیـــیەوە دوور دەکەونەوە، باڵندەی کوکو بـۆ مـاوەیەک لە شـوێنێکی نـزیکەوە ســەرلەنوێ بەردەوام دەبێــت لە چـاودێریکردن و ئاگـاداربوون لەوەی دەگوزەرێت.

ئەگەر شـتێک بەسـەر زڕدایـکەکەدا هـات، یـاخود ئەگەر دەرکی بەوە کرد هەڵەیەک هەیە و هێلانەکەی جێ هێشـت، ئەوا کوکووەکە خێرا دەچێـت هـێلکەکەی هەڵـدەگرێتەوە و بەردەوام دەبێـت لە گەڕان بە دوای قوربـانییەکی دیـکەدا، واتە: بە دوای زڕدایکێکی دیکەدا.

بێچووی کوکووەکان، پێش خوشک/برا زڕەکانی دیـکەی لە هێلکە دێنە دەرەوە، وەک دەڵێن: "دایکی ببینە، کچـی بخـوازە"، ئەمـانیش یەکەم کاریـان ئەوەیە هەر کە زڕدایکیـان ئەگەر بـۆ مـاوەیەکی کەمـیش بێـت هـێلانەکەی جـێ هێشـت، بە پـاڵ و پشتاوپشـت ئەو هێلکـانە هەڵـدەدەنە خـوارەوە کە هێشـتا هەڵنەهاتوون.

بێچووە کوکـووەکە کە هێشـتا پەڕی دەرنەکـردووە و چـاوی هێشـتا نەکـراوەتەوە، لەم بـابەتەدا زۆر لێهـاتووە. بە هاوکـاریی چاڵی پشـتی کە ڕووتەڵە، هـێلکەی زڕ خوشـک/براکـانی وەک کۆڵکێش یەک بە یەک لە پشت دەنێت و هەڵیاندەداتە خـوارەوە. بەم شێوەیەش هێلانەکە تەنیا بۆ خۆی دەمێنێتەوە و ئیتر پاڵی لـێ دەداتەوە.

کاتێک فیسقە داماوەکە بـۆ هـێلانەکەی دەگەڕێـتەوە، سـەیر دەکات تەنیا یەک بێچووی ماوە.

بێگومان تێدەگات کە شتانێکی پێچەوانە ڕوویان داوە، بەڵام لە ئەنجامدا ئەو ئیدی دایکێکە و لە هێلانەکەدا بێچوویەک هەیە کە هێندەی توانیویێتی دەمە پرتەقاڵییەکەی کردووەتەوە و چاوەڕێی خواردن دەکات.

ئیدی لەو ڕۆژە بە دواوە، فیسقەکە تەواوی ڕۆژەکانی بۆ تێرکردنی ئەم بێچووە نامۆیە بەسەر دەبات کە سکی هەرگیز تێربوون نازانێت.

زڕدایکەکە بێوچانانە هەموو جۆرە مێروویەک و کرمی قەڵەوی تۆپیو و مێرووولەی گەورە گەورە بۆ هێلانەکەی دەگوازێتەوە.

بێچووە کوکووەکە هەرچیەک هەبێت حەپەلوشی دەکات، بەڵام بە هیچ تێر نابێت.

بێچووەکە دوای ماوەیەکی کورت کە گۆشتی گرت و خڕوخەپان بوو، لەو فیسقە بچووکەی خۆراکی پێ دەدات زۆر گەورەتر دەبێت.

دایکە فیسقەکە، بە درێژایی چەندین ڕۆژ بێوچان هەوڵ دەدات و دێت و دەچێت تا ئەو بێچووە خەپەیەی تێر بکات.

کاتێک فیسقە دراوسێکانی هەست بەو دۆخە سەیر و نامۆیەی ناو هێلانەکە دەکەن، کەشێکی سەیر و سەمەرە دروست دەبێت. جۆرەها قسە و قسەڵۆک بڵاو دەبێتەوە.




- ئای ئای ئای! کچێ ئەوە تۆ چی دەرخواردی ئەمە دەدەیت! ئای سەیرکە، چەند قەڵەو بووە؟!

- هیچ مەپرسە! هەر دەیکەین بەدەمیەوە، هەر تێر نابێت.

- ماشائەڵڵا ماشائەڵڵا! ئەوانەی ئێمە هێشتا چاویان نەکردووەتەوە.

- گیانەکەم، شیرەکەم باشە، شیرەکەم!

- شیری چی؟ ئەوە تۆ باسی چی دەکەی؟

- شیری باڵندە! هاهاهاهاها

فیسقە باوکەکە سەری لێشێواوە و لە دۆخەکە تێناگات، بەڵام هیچ قسەش ناکات. لە ئەنجامدا هەموو پیاوان منداڵی خرپنیان خۆش دەوێت نەک منداڵی سیس.

- خانم، بۆ خاتری خـوا ئەمە لە کـێمان دەچێـت؟ لە خێزانـی ئێوەدا لەم شێوەیە گەورە هەیە؟

- بە خـوا زاوایەکـمان هەبـوو، مێـردی پـوورەکەم، ئەویـش لە منداڵیـدا بەم شـێوەیە گەورە بـوو. پـووری خوالێخۆشـبووم وا باسی دەکرد.

- ئاخر منداڵ لە زاوا دەچێت؟

- فورات، ئەوە تۆ دەتەوێت بڵێی چی؟

- هیچ گیانەکەم، چی بڵێم؟ ئەمە برسیەتی، برسی. با من بچم کرمێ مرمێ شتێکی بۆ بدۆزمەوە.

- دە بڕۆ بڕۆ! درەنگ نەکەوی ها! سـەیرکە ئەهـا چـۆن برسـی بـووە! ڕۆڵەکەمممـم، خـرپنەکەمممم! ڕۆحەکەی دایکییـی تێربوون نازانێت!

کوکوی دایک کە دەبینێـت کارەکـانی وەک خـۆی دەڕوات، دەمـێکە ڕۆیشـتووە، هەرچۆنێـک بێـت ڕێگـا ئاسـانەکەی دۆزیـوەتەوە و بـۆ بەردەوامیـدان بە ڕەچەڵەکـی و قوربـانییەکی نـوێی بـۆ خـۆی دۆزیـوەتەوە و لەوێـش هێلکەیەکـی دانـاوە و دەستی بە جێبەجێکردنی پلانەکەی کردووە.

لە پاش سێ هەفتە، بێچووە کوکووەکە لە دایک و بـاوکەکەی گەورەتـر دەبێـت. کاتێـک تەمەنـی دەگـاتە شـەش هەفـتە، ئەو

هێلانەیەی تیایدا گەورە بووە تێکوپێک دەدات و دەفڕێت و دەڕوات.

لە کۆتایی گەشتێکی سەدان کیلۆمەتری، کۆچ دەکات بۆ ئەو شار و نیشتمانە دوورانەی باڵندە کوکووەکانی وەک خۆی لێ دەژین.

زڕدایک و زڕباوکەکە کە باشترینی ئەم جیهانەن و ئەویان تا ئەم تەمەنە بەخێو کرد و نان و ئاویان لەپێناو گەورەکردنی ئەودا لە خۆیان حەرام کردبوو، بە دڵخۆشیی گەورەکردنی منداڵێکی ئاوا باش، دەست دەکەن بە دروستکردنی هێلانەیەکی نوێ بۆ خۆیان، یان نۆژەنکردنەوەی هێلانە تێکچووەکەیان.

هەمدیسان لە زەل و قامیشەکان، لە لقی درەختەکان و نێوان گیا گەڵا پانەکانی نزیکەوە هەمان دەنگ دەبیسترێت، ئەم دەنگە دەنگی کاتژمێرێکی کوکوی سویسری نییە، بەڵکو دەنگی باڵندەیەکی کوکوی ڕاستەقینەیە.

کو کو! کو کو ! کو کو!



# خاتوو زەردەواڵەی زەوی هەڵکۆڵ



هەمــوو دایکــان پــێش ئەوەی کۆرپەکەیــان بێــتە دونیــاوە، بەپێــی توانــای خۆیــان کۆمەڵێــک ئامادەکــاری دەکەن. هەنــدێکیان زیــادەڕەوی دەکەن، هەندێکیشــیان تەنــانەت بە ئەســتەم بــڕی پێویســت پەیــدا دەکەن. لە ڕاســتییدا تەنیــا دایکــان بەو شــێوەیە نــین، باوکــانیش هەر وان، ئەو دۆخەش بۆ هەندێک لە باوکان دەرفەتە.

- فیکرەت، ئەوە چییە؟
- پلەیستەیشن!
- ئاخر فیکرەت، ئێستا تۆ بۆ ئەوەت کڕیوە؟
- ئەی نابێ لەگەڵ کوڕەکەم یاری بکەم؟
- فیکرەت، هێشتا شەش مانگی ماوە لە دایک بێت!

تەنــانەت لە جیهــانی ئاژەڵانیشــدا ئامادەکــاری جۆراوجــۆری سەرســوڕهێنەر، چــالاکی جۆشوخرۆشــی پێش لەدایکبوون ڕوو دەدات.

باڵندەی مێیە هێلانە دروست دەکات، تەنانەت ماسییەکان بە دوای گۆشەیەکی دوورەدەست و تەنیادا بۆ دانانی هێلکەکانیان دەگەڕێن.

شێردەرە گەورەکانی ئەفریقا، پەنا دەبەنە بەر شوێنێکی پارێزراو لە دڕندە چاوبرسییەکان، تەنانەت کەمتیاری پەڵەدار بە دوای شوێنێکی ئارامدا دەگەڕێت.

بەڵام ئەو ئامادەکارییە هەستیارانەی زەردەواڵەی زەوی هەڵکۆڵ پێش بوونە دایک ئەنجامی دەدات، زۆر سەرسوڕهێنەرن، مرۆڤ سەرسام دەکەن. بەتایبەت جا ئەگەر بزانن ئەم دایکە بەئەمەکە هەرگیز بە چاوی دونیا کۆرپەکەی نابینێت.

## هێلانەیەکی نهێنی و شاراوە

خاتوو زەردەواڵەی زەوی هەڵکۆڵ، سەرەتا چاوێکی بەدەوروبەریدا گێڕا. ڕاست و چەپ و سەر و خواری پشکنی و بەباشی دڵنیابوو لەوەی کەس چاودێری ناکات، بەخێرایی چاڵێکی لە زەویدا هەڵکۆڵی.

زەردەواڵە زەوییە هەڵکۆڵەکان، وەک لە ناوەکانیاندا دیارە، جیاواز لە زەردەواڵەکانی دیکە، بە شێوەیەک بەدیهێنراون کە

ئەنــدامەکانی توانــای کــاری هەڵکۆڵینیــان هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشــدا، هەڵکــۆڵینی زەوی بــۆ گیانــدارێکی وەک زەردەواڵە کارێکی ئاسان نییە.

خاتوو زەردەواڵە، سەرەتا بە چەناگە بەهێزەکانی پــارچەیەکی بچووکی لە زەوییەکە لێ کردەوە. پاشان بە قاچەکانی پێشــەوەی ئەو پارچانەی گرت و بە لای ڕاست و چەپدا فڕێی دان.

هەر وا کونێکی ڕێك نا کە ڕاست بەرەو چەقی زەوی بچێــتە خوار، بەڵکو کونێکی لاری وەک ڕێڕەوێکی دابەزینی دروســت کرد.

پاشــان ڕاوەســتا و جــارێکی دیــکە دەوروخــولێکی لێــدا و یەکێکی بینی وا بەرەو لای دێت.

ئەوەی دەهات قالۆنچەیەکی خانەنشین بــوو لە مۆزەخــانەی ئیتنۆگرافی کە زۆر خەمبار دیاربوو، لەگەڵ ئەوەشــدا، پیــاوێکی تووڕە بوو.

- خاتوو زەردەواڵەی زەوی هەڵکۆڵ، بەیانیت باش!
- قالۆنچەی بەڕێز، بەیانی ئێوەش باش.
- هیوادارم مۆڵەتت لە شارەوانی وەرگرتبێت.
- ها؟
- شارەوانی دەڵێم، شارەوانی. بۆ ئەو چاڵ هەڵکەندنە دەڵــێم. هیوادارم مۆڵەتت وەرگرتبێت.



خاتوو زەردەواڵەی زەوی هەڵکۆڵ، ئاوا لەسەرەوە تـا خـوارەوە تەماشایەکی قالۆنچە پیرەکەی کـرد و لە ناخیـدا بە خـۆی وت: "ئەمە نابێت، ئەمە زۆر پیرە! دانەیەکی زۆر گەنجترم پێویستە!"

- بەڵێ، بێگومان مۆڵەتی پێویستم هەیە.
- هەندێکیش بەبێ مۆڵەت هەڵیدەکەنن.
- بەڕاست... ئەی وا نییە؟
- بەبێ مۆڵەت نابێت.
- بەدڵنیاییەوە!
- ئەگەر شوێنەواری مێژوویـی و شـتی وا دەرکەوت پـۆلیس ئاگاردار بکەرەوە.

خاتوو زەردەواڵەی زەوی هەڵکۆڵ تووڕە بوو، لەبەر خـۆیەوە وتی: "بەهۆی ئەم پیرەوە عارەقە بە پشتمدا وشک بـووەوە". زۆر کارم مابوو کە دەبوو ئەنجامیان بدەم.

- قالۆنچەی بەڕێزی خانەنشینی مۆزەخانەی ئیتنۆگرافی، نازانم ئا لەم چاڵەدا شوێنەواری مێژوویی هەیە یان نا، ئەگەر کەمێکی دیکە هەڵیتوپەڵیت بڵێیت، لەوانەیە یەکێک بکەوێتە ناوی.

- مەبەستت لە چییە؟ تێنەگەیشتم!

- مەبەستم لەوەیە لێرە بڕۆ، ئەگینا دەتخەمە ناوی.

کاتێک قالۆنچە پیرەکە زانی خاتوو زەردەواڵەی زەوی هەڵکۆڵ تووڕە بووە، زیاتر خۆی بۆ نەگیرا و هێواش هێواش پاشەکشەی کرد و جێی هێشت و لەوناوە دوور کەوتەوە.

خاتوو زەردەواڵە جارێکی دیکە بەوردی دەوروبەری پشکنیەوە و دەوروخولێکی لێدا، کەس لەو دەورە نەبوو، بەڵام ئەو پارچە بەرد و خۆڵەی بە ڕاست و چەپدا هەڵیدابوو بووە مەراقی، بۆیە بیری کردەوە کە دوای خۆی ڕەنگە زۆر ئاژەڵ ڕێیان بکەوێتە ئێرە و بڵێن: "یەکێک لێرەدا شتێکی خستووەتە ژێر خاکەوە! با بزانم چییە!" ئینجا دەست بکات بە هەڵکۆڵینی. لەبەر ئەوە هەموو ئەو پارچە بەرد و خۆڵەی دەریدابوو، بە چەناگەی دووری خستنەوە.

پێویست بوو هەمووی پەرتەوازە بکات، کەمێک بۆ ئێرە، کەمێکیش بۆ لاکەی دیکە، بە شێوەیەک کەڵەک دروست نەکات.

پێویست بوو مێرووەکان بەکەم سەیر نەکات، جا ئەگەر مێروولەکان هەست بکەن لێرەدا شتێک هەیە، ئەوەی ژێر زەوییان دەهێنایە دەرەوە. خودا ڕەحم بکا، تەنانەت بیرکردنەوە لەوە بۆ خاتوو زەردەواڵەی زەوی هەڵکۆڵ چەندە ترسناک بوو!

ئایا بچووایە پشتەملی ئەو قالۆنچە پیرەی بگرتایە باشتر نەدەبوو؟ مێشکی بچووکی خاتوو زەردەواڵەی زەوی هەڵکۆڵ بۆ ماوەیەک بەو پرسیارەوە سەرقاڵ بوو، بەڵام دواتر بیری کەوتەوە کە ئەوەندە پیرە ڕووداوەکانی بیر نایەتەوە.

ئەو چاڵەی زەردەواڵەیەکی زەوی هەڵکۆڵ دروستی کردووە، هەر ئەوەندە دەبێت خۆی بچێتە ناوی. نە گەورەتر، نە بچووکتر. تەنیا لە کاتی تەواوکردنیدا، یەک ژووری منداڵی بۆ زیاد دەکات.

لە هەمان کاتدا، ئەم ژووری منداڵەی وەک کۆگایەک بەکار دەهێنا.

زەردەواڵەکە کە هەڵکۆڵینی چاڵەکەی تەواو کرد، سەرلەنوێ بەوردی دەوروخولێکی چواردەوری دایەوە، پاشان بەباشی دەمی چاڵەکەی داخست و بێ دواکەوتن و بەفیڕۆدانی کات دەرچوو بۆ ڕاو.

پێتان وایە لە دوای کارێکی لەم شێوەیە، هەر کەسێک بێت، برسی نابێت؟ بەڵام خاتوو زەردەواڵەی زەوی هەڵکۆڵ ئەم جارە

نێچیرەکەی بۆ خۆی ناوێت، بەڵکو بۆ ئەو کۆرپەیەی دەوێت کە لەدایک دەبێت!

بە نێو گژوگیا سەوز و وشک و دەوەنەکاندا تێپەڕی و ڕۆیشت. کاتێک کرمێکی ئاوریشمی خرپنی بینی کە لەسەر لقی گەڵایەک خۆی دابووە بەر خۆر، بێبەزەییانە پەلاماری دا.

لە ڕۆژێکی ئاسایی ڕاودا، زەردەواڵەیەک لە ماوەی چەند چرکەیەکدا ئەم کرمی ئاوریشمە لە چالاکی دەخات، لە ماوەی چەند خولەکێکدا دەیخوات و تەواوی دەکات، بەڵام ئێستا دۆخەکە جیاوازە و زەردەواڵەکە پلانێکی دیکەی هەیە.

زەردەواڵەکە، بە جزووەکەی لە قەڵەوترین شوێنیەوە بە کرمە ئاوریشمییەکەوەی دا. ژەهری جزووەکەی کرمە ئاوریشمەکەی نەکوشت، بەڵکو ئیفلیجی کرد! ئەوەش بە واتای ئەوە دێت کە هەرگیز جارێکی دیکە جووڵە ناکاتەوە.

خاتوو زەردەواڵەی زەوی هەڵکۆڵەکە، بە قاچ و چەناگە بەهێزەکانی کرمە ئیفلیجەکە هەڵدەگرێت و دەیبات بۆ لانەکەی، واتە: بۆ ئەو چاڵەی دروستی کردووە. ئەو شتە لادەبات کە بە شێوەیەکی کاتی سەری چاڵەکەی پێ گرتووە، پاشان کرمە ئاوریشمەکە ڕادەکێشێتە ناو چاڵەکە و دەیبات لە ژووری کۆرپەکەدا دایدەنێت.

کرمە ئاوریشمەکە ئەگەر لە دوای هەموو ئەو ڕووداوانە لە ترساندا زیرەی نەکردبێت، دەبێت هێشتا زیندوو بێت.

بێگومان ئەگەر بەوە بوترێت ژیان.

زەردەواڵەکە دوای ئەوەی کرمە ئاوریشمە چەورەکەی لە ژوورەکەدا دانا، هێلکەیەکی لەسەر دەکات!

هەموو ئەو هەوڵ و تەقەلایانەی و ئەوانەشی لەمەودوا ئەنجامیان دەدات، لە پێناو هێلکەیەکی بچووکدایە کە لە دەنکە برنجێک بچووکترە.

پاش ئەوەی هێلکەکەی کرد، زەردەواڵەکە لە چاڵەکە هاتە دەر. ئێستا تەنیا یەک کار ماوە: توند توند داخستنی دەمی چاڵەکەیە!

زەردەواڵەکە لەگەڵ هاتنەدەرەوەی لە چاڵەکە، دەمی چاڵەکەی بە پارچە بەرد و خۆڵ پڕکردەوە. بۆ ئەوەشی ئەو پارچانە نەبنە جێی سەرنج، بە بەردێک کە بە چەناگەیەوە گرتبووی، خۆڵی سەر چاڵەکەی کوتایەوە و ڕێکی کردەوە.

بەڵام ئەو ڕێکییەش لەوانەیە ببێتە جێی سەرنج، لەبەر ئەوە بە قاچە زبرەکانی ئەو شوێنانەی تەختی کردبوون، کڕاندی و بەتەواوی لەگەڵ زەوییەکەدا گونجاندی.



ئیدی کەس بەئاسانی نەیدەزانی لەو شوێنەدا هێلانەیەکی زەردەواڵە هەیە، بەڵام زەردەواڵە دایکەکە بەوەشەوە نەوەستا، چونکە دایکان هەردەم بەو شێوەیەن. ئەوان بەئاسانی بۆ بێچووەکانیان یەکلا نابنەوە، ئەوەی لەدەستیان بێت ئەنجامی دەدەن.

خاتوو زەردەواڵەی زەوی هەڵکۆڵ وەک ئەوەی گرتنەبەری دەیان ڕێوشوێن بەس نەبێت، یەک دوو هێلانەی ساختەی بەتاڵی لای ڕاست و چەپی هێلانەکە دروست کرد.

ئەو کرمۆکەیەی لە دوای ماوەیەکی کەم لە هێلکەکە سەر دەردەکات، تەنانەت بێ ئەوەی پێویست بە کردنەوەی چاوەکانی بکات، ئەو کرمە ئاوریشمە گەورە تازەیەی لەلایەن دایکە میهرەبانەکەیەوە لە بەردەمیدا دانراوە دەخوات و تەواوی دەکات، تا بەباشی گەشە دەکات و وای لێدێت بتوانێت لە چاڵەکە بێتە دەرەوە. کاتێک لە چاڵەکە دێتە دەرەوە، دایکی کە

پێش ئەوەی ئەم بێچووەی بێتە دونیاوە، بە هەستیارییەوە هەموو ئەم ئامادەکارییانەی ئەنجام داوە، دەمێکە لەم دونیایە ڕۆیشتووە.

باشە، ئێوە تەنانەت لە بەشێکی ئەم چیرۆکەدا گیرتان نەخوارد؟

لانی کەم ئەوە نەبووە جێی پرسیار لاتان و تامەزرۆ نەبوون بزانن کە: "ئەگەر چی هەموو شتێک تەواوە، بەڵام بۆچی ئەو کرمە ئاوریشمەی نەکوشت و بە ئیفلیجی جێی هێشت؟"

با با بێگومان بووەتە جێی پرسیار لاتان، چونکە ناکرێت نەبووبێت؟

خاتوو زەردەواڵەی زەوی هەڵکۆڵ، کرمێکی گەورەی ئاوریشمی لای بێچووەکەی دادەنێت، بۆ ئەوەی کاتێک لە هێلکەکە دێتە دەرەوە، بیخوات، تا بەباشی گەشە بکات و برسی و تینو نەبێت. ئەگەر ئەو کرمە ئاوریشمەی بکوشتایە، ئەوا کرمەکە لە ژێر خاکەکەدا دەپووکایەوە و کاتێک بێچووەکە لە هێلکەکە دەهاتە دەرەوە کرمێکی ئاوریشمی پوکاوەبووی دەبینی، لەوانەش بوو تێکەڵ بە خۆڵەکە بووبووایە.

لەبەر ئەوە کرمێکی ئاوریشمی ئیفلیج بۆ ماوەیەکی زۆر لە ژیاندا دەمێنێتەوە و کاتێکیش کرمۆکەکە لە هێلکەکە دەرچوو، ڕووبەڕووی شاخێک لە خۆراکێکی تازە دەبێتەوە کە لەبەردەمیدا دانراوە.

چۆنە، زۆر سەرسوڕهێنەر نییە؟

ئێستا ئەو چیرۆکەی لەم بەشەدا بۆم باس کردن ئاوا بیهێننە پێش چاوی خۆتان.

ئەمە چیرۆکێکی ئەفسانەیی نییە، هەرچەندە من وەک چیرۆکێک بۆم باس کردن، بەڵام ئەمە چیرۆکێک نییە، جگە لە هەندێک نوکتە و کەمێک زیادکردن، ئەمانە ڕووداوگەلێکی ڕاستەقینەن کە ملیۆنان ساڵە لەسەر زەوی ڕوو دەدەن. ئێستا با هەمووی بە ڕیز وەبیر بهێنینەوە:

- زەردەواڵەی زەوی هەڵکۆڵ، چاڵێکی لار لە زەویەکەدا دروست دەکات. لە کۆتایی چاڵەکەشدا ژوورێکی بچووک دروست دەکات.
- ۆ ئەوەی شوێنی چاڵەکە دیار نەبێت، ئەو خۆڵەی دەریهێناوە بەڕاست و چەپدا پەرتەوازە دەکات.
- کرمێکی ئاوریشم ڕاو دەکات، بەڵام نایکوژێت، بەڵکو تەنیا ئیفلیجی دەکات.
- مێرووەکە دەباتە چاڵەکەوە و لە ژوورە بچووکەکەدا دایدەنێت.
- پاشان لەسەر کرمەکە هێلکەیەک دەکات و جێی دەهێڵێت، ئینجا خۆی دێتە دەرەوە.
- دەمی چاڵەکە بەباشی دەگرێت.

• به بەردێک کە بە چەناگەی هەڵیدەگرێت، دەمی چاڵەکە دەکوتێتەوە و ڕێکی زەوی دەکاتەوە، بۆ ئەوەی هەستی پێ نەکرێت.

• لەبەر ئەوەی ئەگەر زۆر ڕێکیشی بکاتەوە، ڕەنگە هەستی پێ بکرێت، بە قاچە زبرەکانی دەیڕوشێنێت و لەگەڵ خاکی چواردەوریدا دەیگونجێنێت.

• وەک ئەوەی هەموو ئەو ڕێ و شوێنانەی گرتوونیەتە بەر، بەس نەبن، لەلای ڕاست و چەپی هێلانە ڕاستەقینەکە چەند هێلانەیەکی ساختە دروست دەکات.

• لە کۆتاییدا پاچ و خاکەنازەکەی لە گۆشەیەکدا دادەنێت و دەڕوات بۆ ئەوەی چیتر نەگەڕێتەوە.

• لە پاش ماوەیەک هێلکەکە دەتروکێت و کرمۆکەیەکی زەردەواڵە دێتە دەرەوە. کرمۆکەکە بە حەزێکی زۆری خواردنەوە دەست دەکات بە خواردنی ئەو شاخە خۆراکەی دایکی لەبەردەمیدا دایناوە و هێشتا هەڵمی لێ هەڵدەسێت.

• کرمۆکەی زەردەواڵە زەوی هەڵکۆڵەکە گەشە دەکات و لە چاڵەکە دێتە دەرەوە بۆ دونیایەک کە هیچ نەیبینیوە و هیچیشی لە بارەوە نازانێت.

• ئەگەر ئەمە زەردەواڵەیەکی زەوی هەڵکۆڵی مێیە بێت، ئەوا هەموو ئەو ئامادەکارییانەی دایکی بۆی کردووە، بێ ئەوەی ببینێت، ئەمیش بۆ ئەو بێچووەی دەکاتەوە کە هەرگیز نایبینێت.

• بەشێک لە مرۆڤەکان دەڵێن: هەموو ئەم چالاکییە پلاندار و بەرنامە بۆ دارێژراوانەی زەردەواڵەی زەوی هەڵکۆڵ کە مێشکێکی ڕێکوپێکیشی نییە، ئەم هەوڵ و فیداکارییە نائاساییانەی لەپێناو بێچووەکانیدا ئەنجامی دەدات کە هەرگیزاوهەرگیز نایانبینێت، هەر لەخۆوە و بەڕێکەوت فێر بووە.

کاتێکیش لێیان دەپرسین: "باشە، بەڵام چۆن ژەهرێکیان پەیدا کرد کە نێچیرەکانیان ناکوژێت، تەنیا ئیفلیجیان دەکات؟" وەڵامەکانیان زۆر ناگۆڕێت:

"لە ماوەی ملیۆنان ساڵدا خۆی لەخۆیەوە و بەڕێکەوت پەرەی سەندووە."



# مراوییەکی قارەمان بەرانبەر ڕێوییەکی فێڵباز



ئایا مریشکەکان ترسنۆکن؟ بەڵـێ، مریشـکەکان ترسـنۆکن، بەڵام مریشکە دایکەکان نا.

هەرکەسێک ویسـتبێتی مریشـکێکی دایـکەی خـرپن تـووڕە بکات، یان گـاڵتەی لەگەڵـدا بکـات کە جووجەڵەکـانی لە ژێـر باڵیدان، ئەمە دەزانێت.

ئەوە هەر منداڵی شـار نـین کە تەنیـا لە پشـووەکاندا دەچـنە گوند و لەبەر ئەوەی لە مانگـا گەورەکـان و بەرانە شـاخدارەکان و تەنانەت قەل و قازەکـان دەترسـن، خۆیـان بە مریشـکەکانەوە سەرقاڵ دەکەن، بۆیان دەردەکەوێت کە مریشکی دایـکە چەنـدە ئازایە؛ بەڵکو تەنانەت گورگە برسییەکان و ڕێـوییە فێڵبازەکـان و سەگە بەرەڵاکانیش دەزانن ئەم مریشکە ترسنۆکانە کاتێک دەبـنە دایـک، چەنـدە چـاونەترس و ئـازا دەبـن، کاتێـک پێیـان وایە بێچووەکانیان لە مەترسیدان، چەندە قارەمانانە بەرگریی دەکەن.

هەروەک مرۆڤەکان، ئـاژەڵە دایکەکـانیش کاتێـک ئاسایشـی بێچووەکانیـــان بـــووە جـــێگەی بـــاس، هەریەکێکیـــان دەبـــنە قارەمانێکی چاونەترس.

کەرەکێوییەکـــان دەم و لـــووتی تیمســـاحەکان دەشـــکێنن، زەڕافەکـــان لەقە لە شـــێرەکان دەدەن، ئاســـکە کێوییەکـــانیش بە شاخەکانیان سکی کەمتیارەکان هەڵدەدڕن، دۆلفینەکان بە لووتە بەهێزەکانیان زەبری کوشندە لە قرشەکان دەدەن.

ئەو باڵنـــدە بچووکـــانەی هێنـــدەی بەری دەســـت دەبـــن، لە بەرەنگـــاربوونەوەی ئەو مـــارەی بە هێنـــدەی قۆڵێـــک دەبـــن و بەدزییەوە لە بێچووەکانی نزیک دەبنەوە، هیچ دوودڵ نین.

کاتێک بێچووەکـان دەکەونە مەترسـییەوە، هەمـوو دایکێـک بەری چـاوی ڕەش دەبێـت و لە فیـداکردنی گیـانی خـۆی بـۆ بێچووەکـانی سـڵ ناکـاتەوە، چـونکە دایکـایەتی شـتێکە وا لە بوونەوەرێـک دەکـات گیـانێکی دیـکەی زۆر لە گیـانی خـۆی خۆشتر بوێت.

شتێکە ناچێتە عەقڵەوە، چـونکە کـاری عەقـڵ نیـیە! کـاری دڵێکی گەورەیە، کە پڕە لە بەزەیی پاک و بێخەوش.

دەســـتوور و شـــێوازێکە نە بەتیـــۆرییە زانســـتییەکان پێناســـە دەکرێت، نە لە تاقیگەکاندا هاوشـێوەیەکی بەرهەم دەهێنرێـت و نە دەنووسرێت و دادەڕێژرێت.

هاوکێشەیەک هەیە... جا مرۆڤ بێت، یان مارمۆسیتێکی گرگن کە جۆرە مەیموونێکە هێندە بچووکە لە بەری دەستدا جێگەی دەبێتەوە و هەموو جارێک بە یەک سک دوو بێچووی دەبێت، یاخود ماری ئاناکۆندایەکی گەورەی سەوزی دە مەتری کە ئەوانەی دەیبینن لە ترساندا دەلەرزن. دایکان بێچووەکانیان لە گیانی خۆیان خۆشتر دەوێت. کاتێک بەزەیی پاک و بێخەوش لە دڵەکانیاندا دەدرەوشێتەوە، هەر یەکەیان دەبنە پاڵەوانی بەزەیی.

## ئەو نا، من بگرە!

ئاژەڵانی وەک ئاسکە کێوی کە دەتوانن بەخێرایی ڕاوبکەن، لە ڕۆژێکی ئاساییدا کاتێک هەست دەکەن چەقەڵێک، گورگێکی ڕەش یان شێرێک لە ناو گیای زەردبووودا خۆی حەشارداوە و چاوەڕوانی پەلاماردانە، بێ بیرکردنەوە ڕا دەکات.

ڕاستییەکەی، دروستترین کار هەر ئەوەیە، بەڵام کاتێک بێچووەکانیان لەلایە کە هێشتا ناتوانن هێندەی خۆیان بەخێرایی ڕابکەن، کارەکە دەگۆڕێت. لەبری جێهێشتنی بێچووەکانیان و هەڵاتن، ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ڕاوچییەکەدا هەڵدەبژێرن.

به شاخە تیژەکانیان بێت، یـان پـێ پتەوەکانیـان، بـوێرانە بـۆ پاراستنی بێچووە خۆشەویستەکانیان دەچنە پێشەوە.

ئاسکە چاو جوان و نازدار و بێدەنگەکان، هەر کە هەسـتیان بە مەترسی کرد، خێرا دەچنە پشت بێچووەکانیانەوە. ڕەنـگە ئەوە بە لای ئێمەوە سـەیر بێـت، چـونکە ئـێمەی مرۆڤەکـان کاتێـک دەترسین، خۆمان دەدەینە پاڵ یەکێک کە پـێمان وایە لە خۆمـان بەهێزتـــرە، یـــاخود ئەوەی بمانەوێـــت بیپـــارێزین دەیخەیـــنە پشتمانەوە.

باشە، بۆچی ئاسکەکان دەچنە پشت بێچووەکانیانەوە؟

هۆکـاری ئەوەش ئەوەیە کە ڕاوچیـیە دڕنـدەکان بەگشـتی لە پشـتەوە پەلامـاری نێچیرەکانیـان دەدەن. ئاسـکە دایـکەکە، بەم شـــێوەیە هەوڵ دەدات چەنـــد لێـــدانێک لە دەم و لـــووتی ئەو مەترسـییە بـــدات کە لە نزیکبـــوونەوەدایە و خـــۆی بپارێزێـــت. تەنانەت ئەگەر سەرکەوتوو نەبوو و ئەوەشی بـۆ نەچـووە سـەر، خـۆی لە ڕاوچیـیە بێبەزەیـیەکە نزیـک دەکـاتەوە و بەم شـێوەیە هەوڵ دەدات لە بێچووەکەی دووری بخاتەوە. ئەمە جـۆرێکە لە بەرگریکردن لە بێچـووەکەی کە بەم واتـایە دێـت: "ئەو نـا، مـن بگرە".

## "ئای لایکت موڤت موڤت! ئای لایکت موڤت موڤت!"

زۆرێک لە زیندەوەران کۆمەڵێک تایبەتمەندیی پارێزگاریان هەیە، وەک؛ خۆگۆڕین بۆ هەڵخەڵەتاندن یەکێکە لەوانە.

بە واتایەکی تر: ئەو پێستە ڕەنگاوڕەنگە نەخشێنراوەی لەبەریدایە، لەو شوێنەی تیایدا دەژی بەئاسانی بەرچاو ناکەوێت! چەند مەترێک لەولاتر هاوار ناکات و بڵێت: "من لێرەم! وەرە بمخۆ!"

کەرەکێوییە خەتدارەکان، ئاسکە سوورەی خاڵ خاڵ، ئاسک لە ڕەنگی گیای وشکبوو... هتد. ئەمانە زۆربەی کات خۆیان و بێچووەکانیان لە ڕاوچییەکان دەشارنەوە و دەپارێزن، بەڵام شاردنەوەی بێچووەکان هەمیشە ئەوەندە ئاسان نییە. چونکە وەک هەموو بێچووە بچووکەکان، ئەوانیش بەئاسانی لە شوێنی خۆیان ڕاناوەستن.



ئاسـکە سـوورەکان، جـگە لەو کاتـانەی تیایـدا دەلەوەڕن، بێچووەکانیـان لە نێـو گیـا و دەوەنەکانـدا دەشـارنەوە تـا ئەو تەمەنەی دەتـوانن بەباشـی ڕابـکەن. تـا بکرێـت لە دوور یەک ڕادەوەستن، بەڵام لە مەودایەکدا کە هەموو کـات بێچووەکانیـان لێ دیار بێت. بەم شێوەیەش ڕاوچییەکـان کە دایـکەکە دەبیـنن، ڕەنگە بێچووەکە نەبینن.

بەڵام بێچـووە لاسـار و بزێوەکـان، زوو زوو لەو شـوێنانەی دایکیان حەشاریان داون، لەنێو دەوەن و سێبەرەکاندا دەردەچـنە دەرەوە، بە بچـووکترین قـرچە قـرچ، نـاتوانن خۆیـان بگـرن و سەریان بەرز نەکەنەوە و سەیری دەوروبەریان نەکەن.

- دایکە دایکە! دایکە سەیرکە، ئەلێکسی شێر هاتووە!
- وسسسس! بێدەنگ بە! کچێ شێت مەبە!
- ئەلێکس ئەلێکس! ئای لایکت موڤت موڤت! ئـای لایکـت موڤت موڤت!
- ئەی خـودا لە نـاوت نەبـا، تـۆ چ ئەولادێکیـت. ئەرە بەخـوا بیستی، ئەوە دێت!
- ئای لایکت موڤت موڤت! ئای لایکت موڤت موڤت!
- ئەگەر مـن جـارێکی دیـکە هێشـتم سـەیری فیلمکـارتۆن بکەیت!
- ئای لایکت موڤت موڤت!

دایکان زوو زوو بە لووتیان پاڵ بە بێچووەکانیانەوە دەنێن کە نــاتوانن لە شــوێنی خۆیــان ڕاوەســتن، بەوەیــش وا دەکەن لە شوێنەکانیان بمێننەوە. ئەگەر ئەوەیش سەری نەگرت، بۆ ئەوەی هەست بە بێچووەکانیان نەکرێت، وەک دوایین چـارە بـێ هـیچ دوودڵی و سڵەمینەوەیەک ڕاست بەرەو ڕاوچییەکە دەچن.

ئەمە فیداکارییەکی گەورەیە، بەڵام دایکایەتی زۆر گەورەترە!

ئەم جۆرە قارەمـانێتیە تەنیـا ئـاژەڵانی وەک ئاسـک تۆمـاری نــاکەن. بەڵکــو پشــیلە گەورەکــانیش وەک پڵنــگ کە بەهــۆی ڕاوکردنیــان لەلایەن مرۆڤەکــانەوە خەریــکە وەچەیــان لەنــاو دەچێت، بۆ ئەوەی بێچووەکانیان نەکەوێتە دەست مرۆڤەکـان کە درنــدەترین ڕاوچــی ســەر ڕووی زەویــن، بــوێرانە دژیــان دەوەستنەوە.

ئەگەر بتـوانن ڕاوچییەکـان بترسـێنن و دووریـان بـخەنەوە، دەگەڕێــنەوە بـۆ ئەو شـوێنەی بێچووەکانیـان تێـدا حەشـارداوە. بەڵام ئەگەر پڵنگیش بن، هەمیشە ئەگەری ئەوە هەیە کە هەرگیـز نەگەڕێنەوە. بێگومان ئەم ئەگەرە بۆ ڕاوچییەکەش دروستە. جـا ئەگەر کەوتبێـتە شـوێن بێچووەکـانی پڵنگێـک، چـونکە پڵنـگ خـۆی مەترسـیدارە، بەڵام پڵنگـی دایـک بە هێنـدەی دە پڵنـگ مەترسیدارترە!

ئەگەر لەناوتانـدا هەیە پڵنگـی ڕاسـتەقینەی نەبینیبێـت، خـۆ پشـیلە داماوەکـانی سـەر شـەقامی بینیـوە، کە چـۆن کاتێـک مەترسی لەسەر بێچووەکانیان دروست دەبێت، نینۆکەکـانی لەو پەنجە نەرمانە دەردەهێنێـت و دەکەوێـتە چنـگ هاویشـتن، مـن خـۆم بەهـۆی زۆر نزیکبـوونەوەم لە بێچووەکـانی، چنگـی لێداوم.



## مراوییەکی قارەمان بەرانبەر ڕێوییەکی فێڵباز

سەبارەت بە باڵندە دایکەکـان، پـێش پاراسـتنی بێچووەکـان شتێکی دیکە هەیە: ئەویش پاراستنی هێلکەکانە!

وەک دەزانــن، گیانــدارە شــیردەرەکان تــا دێــنە دونیــاوە، بــۆ خۆیان لە ئــارامترین شــوێندان و لە منداڵــدانی دایکیانــدا بەدی دەهێنرێن، بەڵام باڵندەکان لەنــاو هــێلکەی هێلانەکانــدان. لەبەر ئەوە پاراستنی ئەو هێلکە هەستیار و ناســکانە و ئەو هــێلانەیەی هێلکەکانی تێدایە بــۆ باڵنــدە دایکەکــان، بە هێنــدەی پاراســتنی بێچووەکان گرنگن.

بەگــوێرەی ئەوەی باڵنــدەکان بەگشــتی هــێلانە لەســەر لقــی درەخــتە بەرزەکــان و ئەو شــوێنانەی پێگەیشــتن پێیــان ســەختە، دروســـــت دەکەن، لە ڕووی پاراســـــتنی هــــێلانە و هــــێلکە و بێچووەکانیان تا ڕادەیەک پارێزراو ئەژمار دەکرێت.

بەڵام زۆربەی باڵندە ئاوییەکــانی دیــکە و بەتــایبەتی مــراوی هێلانەکانیان لەسەر زەوی دروست دەکەن.

بێگومان هێلانەیەک کە لەسەر زەوی بێت و پڕبێت لە هێلکە یان بێچــووی خــڕپن خــڕپن، ئــارەزووی خــواردنی زۆرێــک لە گیانداران دەوروژێنێــت. هێلانەیەکــی باڵنــدەی پــڕ لە هــێلکە و جووجەڵە بۆ مار و ڕێوی و چەقەڵ و گیاندارە قــرتێنەرە گەورە و بچووکەکان وەک خوانی شوێنێکی پێنج ئەســتێرەیی وایە، بەڵام باڵنـــدە دایـــکەکە نیـــازی نیـــیە بەئاســـانی نە هێلکەکـــانی، نە بێچووەکانی بەدەستەوە بدات. ئەویش وەک هەمــوو دایکەکــان زۆر دەمێکە ئامادەیە گیــانی خــۆی فیــدا بکــات لەپێنــاو ئەوەی

جێگەی خۆی لە کتێبی فیداکارە مەزنەکاندا بکاتەوە. هەروەها یارییەک دەزانێت کە کەس چاوەڕێی ئەوە لە "مێشکی باڵندە"یەک ناکات.

باڵندەکانی وەک مراوییە کێوییەکان و کۆرمۆرانتەکان (Cormorant) کە هێلانەکانیان لە کەناری دەریاچەکان و نێوان زەل و قامیشەکان و شوێنە نزمەکاندا دروست دەکەن، کاتێک مەترسییەک بەدی دەکەن کە لێی نزیک دەبێتەوە، بۆ نموونە، کاتێک ڕێوییەک بەدی دەکەن، خێرا لە هێلانەکەیان دوور دەکەونەوە و دەچنە شوێنێک کە ڕێوییەکە بەئاسانی بیانبینێت و وا خۆیان نیشان دەدەن کە نەخۆشن و خەریکە دەمرن. لەو بابەتەدا ئەوەندە سەرکەوتوون کە تەنانەت ئەو ڕێوییە فێڵبازە دەکەنە فیلم.

- ئاییی دایکە گیان، ئاییی!

- ئا! خۆ ئەوە مراوییەکە. قیرە قیڕ دەکات!

- هێی، برادەر ئەوە چیتە؟

- خەریکە دەمرم!

- هەرچەندە پەیوەندی بە منیشەوە نییە، بەڵام با هەر بپرسم: ئەمە چۆن ڕووی دا؟

- ڕاوچییەک تەقەی لێ کردم! ڕاوچی ستەمکار!

- ئێ دە کەواتە با من تۆ بخۆم، هیچ ناڕەزاییەکت هەیە؟

- نا نا! نارەزایی چی نۆشت بێت.

- ئەوە دوا بڕیارتە؟ ئەها ئەوە هاتم!

- وەرە ڕێوی هاوڕێم، وەرە، من خۆ هەر دەمرم.

ڕێوییە برسییەکە بە حەزێکی زۆرەوە ڕاست بەرەو مـراوییەکە ڕادەکات، بەڵام کە خەریکە پێی بگات و بیگرێت، مراوییەکە لە پڕێکــدا لە شــوێنەکەی هەڵــدەفڕێت و دەڕوات، لە شــوێنێک لەولاتر دووبارە خۆی دەداتەوە بە زەویدا...

- ئێ خۆ تۆ دەمردیت، ئێستا چیت بەسەر هاتووە؟

- ئای گیانەکەم، گیانکێشان ئەوەندە ئاسانە؟

هەرچەندە ڕێوییەکە مێشکی کەمێک تێکەڵ و پـێکەڵە، بەڵام کاتێک دەبینێـت مـراوییەکە لە زەویـدا پەلەقـاژەیەتی، ناتوانێـت وازی لێ بهێنێـت، بەڵام دووەم هەڵمەتیشـی بەهەدەر دەچێـت. ئیــتر بەم شــێوەیە کاتێــک مــراوییە پــاڵەوانەکە ڕێــوییەکە بــۆ مەودایەکی باش لە هێلانەکەی دوور دەخاتەوە، باڵ دەگرێـت و دەڕوات، ڕێوییەکەش دەستبەتاڵ دەمێنێتەوە.

دە وەرە، بە ڕێویش دەڵێن تەڵەکەباز! پف!



# دڵەکانی هەشتپێ
# کە پڕن لە خۆشەویستی



ئایا دەزانن بۆچی بە هەشتپێ دەڵێن هەشتپێ؟ ئەگەر ئێوەش وەک من تامەزرۆی ئەمەن، ئەوا یەکەم کار کە پێویستە ئەنجامی بدەن، پەیداکردنی فەرهەنگێکە بۆ گەڕان بە دوای چاوگی وشەکەدا. بێگومان هاوڕێیەک کە لەو بارەیەوە زمانی لاتینی و یۆنانی کۆن بزانێت، زۆر باش دەبێت. ئیتر هەر کامیان بۆتان ئاسان بێت.

نەبێتە شانازی و ئەم شتانە، بەڵام من هەردووکیانم هەیە!

چاوگی وشەی (Octopus) یۆنانی کۆنە، کە لە بنەڕەتدا لە یەکگرتنی وشەکانی (Octo) و ( pous) پێکهاتووە، دەبێتە (octopodia). Octo واتە: هەشت، pous واتە: پێ. Octopus بە واتای هەشتپێ دێت.

ئاشکرایە کە هەشتپێکان هەشت دانە پێیان هەیە. بەگشتی هەمووان ئەمە دەزانن، بەڵام زۆر کەس نازانن کە ئەم سەرپێدانە سەرسوڕهێنەرانە (Cephalopod) سێ دڵیان هەیە.

ئەم سێ دڵە کە بەدرێژایی تەمەن خوێنی شین کە تایبەتە بە هەشتپێکان بۆ ئەو هەشتپێ و سەرە گەورەیە دەنێرێن، بەڵام ئایا ئەوە تەنیا بریتییە لە سێ ترومپای نایابی خوێن؟

یاخود دڵی هەشتپێ سەرپێیەکانیش وەک هی مرۆڤەکان ئەو شوێنەیە کە هەست و سۆزەکانی وەک خۆشەویستیی و میهرەبانیی و بەزەیی تیایدا هەست پێ دەکرێت؟

ئەمە نازانین. بۆ زانینی ئەمە پێویستە ببینە هەشتپێ، بەڵام ئەگەر کەمێک لە نزیکەوە تەماشای ژیانی هەشتپێیەک بکەین، دەتوانین شاهیدی چیرۆکێکی ناوازەی دایکایەتی بین کە لە قووڵایی سەدان مەتری ژێر دەریادا، کە بە هێندەی قووڵاییەکەی تاریکە و بە هێندەی تاریکییەکەشی لە بنی خاکێکی سەیر و سەمەرەی قووڵدا، بەدی دێت و زیندوو ڕادەگیرێت.

بە شێوەیەک کە ئەگەر نەمانبینیبا و نەمانزانیبایە، ڕەنگە هیچ کامێکمان پێشبینی ئەوەمان نەکردایە کە وا نەرمەڵۆکەیەکی سەرپێی وەک هەشتپێ ببێتە یەکێک لە سەرکێشترین پاڵەوانی دایکایەتی لەسەر ئەم هەسارەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر بە چاوەکانیشمان نەیبینین، بە گوێکانیشمان نەیبیستین و بە خەیاڵیشماندا نەیەت، لەم گەردوونەدا، لەم شوێنانە و لەم ئاسمانە بەرینەدا، هەزاران جۆر

جوانیی، سوپرایزی بێشوماری خۆش و دیاری موعجیزەیی بێ حیساب- هەمیش بۆ ئێمە- بەدیهێنراوە، ئەی وا نییە؟

## هێشووە هێلکەکان

ئەو تیشکەی لە دووریی ١٥٠ ملیۆن کیلۆمەتر لە زەوییەوە، لە خۆرەوە دێت، وەک چۆن چاوەکانی هەنگێکی بچووک ڕۆشن و باڵەکانی گەرم دەکاتەوە، کاتێک بەزەیی بێسنوور و بێحسابی خودای گەورە، یەکێک لەو سێ دڵەی هەشتپێ بە ئاگری دایکایەتی دادەگیرسێنێت، ئەم خاتوو سەرپێیە واز لە کار و فەرمانی دەهێنێت و لە نێو تاشەبەردەکانی قووڵایی سەدان مەتری دەریادا بۆ خۆی بەدوای چاڵێکدا دەگەڕێت، واتە: بەدوای هێلانەیەکدا دەگەڕێت.

چونکە هەشتپێکان هەروەک ماسییەکان و هەموو گیاندارانی توێکڵدار یان بێتوێکڵی دیکەی دەریایی، بە هێلکە زیاد دەکەن. بەڵام هێلکەکردن لە ژێر دەریادا و دانانیان هەر وا لە شوێنێکی ئاساییدا کارێکی ژیرانە نییە.

هێلکەکانی پێویستیان بە شوێنێکی پتەوە، هەم بۆ پاراستنیان لە گیاندارەکانی دەریا، هەمیش لە تەوژمەکان، لەبەر ئەوە لە



نێوان تاشە بەردەکاندا پێویستی بە ئەشکەوتێکی بچووکی ئارام هەیە.

کاتێک هەشتپێ دایکەکە شوێنێکی گونجاوی دۆزییەوە، خۆی کۆ دەکاتەوە، دروستتر بڵێم: هەر هەشت قۆڵەکەی کۆ دەکاتەوە و لەوێدا نیشتەجێ دەبێت. پاشان بە یەک جار ٢٠٠-٢٥٠ ، هەندێک جاریش نزیکەی ١٠٠٠ هێلکە دەکات.

هێلکەکانی هەشتپێ، لە دەنکە ترێی گەورە دەچن و وەک هێشووە ترێیەک یەکتریان گرتووە.

بە ڕژێنێکی تایبەتی لکێنەر کە تەنیا بۆ ئەو کارە بەدیهێنراوە، ئەم هێشووە ترێیانە بە دیواری ئەشکەوتە بچووکەکەدا هەڵدەواسێت.

پاشان هەشتپێکە هەمان ئەو کارە دەکاتەوە کە گیاندارانی هێلکەکەر ئەنجامی دەدەن: لە پاڵ هێلکەکاندا لێی پاڵ دەکەوێت (کڕ دەکەوێت)! واتە: چاوەڕوانیان دەکات، دەیانپارێزێت و وەک چاوی ئاگاداریان دەبێت.

بەڵام ماوەی کڕکەوتنی هەشتپێیەکان وەک باڵندەکان ٣-٥ هەفتە نییە، بەڵکو شەش مانگە، لە هەندێک جۆریاندا ٣-٤ ساڵە. هەشتپێ دایکەکان، بە درێژایی ئەم ماوەیە هێلکەکانیان بۆ ساتێکیش جێ ناهێڵێن. بۆ ئەوەی هێلکەکان بەئاسانی ئەو بڕە ئۆکسجینەی پێویستیانە هەڵیمژن، لە چەند کاتێکی دیاریکراودا شەپۆل بە ئاوەکە دەکەن و هەواکەیان بۆ دەگۆڕن و نوێی دەکەنەوە. بەو قوڵە مژەرانەی یەک بەیەک دەست بە هێلکەکاندا دەهێنن و بەو شێوەیەش وا دەکەن قەوزە لەسەریان دروست ببێت.

قەوزەکان، وردە زیندەوەرن کە لە دەریاکاندا دەژین و بۆ هەڵهێنانی هێلکەکان بەسوودن. هەروەها هێلکەکان لە چاوی ڕاوچییە برسییەکان دەشارێتەوە.

بەدرێژایی ماوەی کڕکەوتنەکە، دایکەکە هیچ شتێک ناخوات، چونکە بۆ ڕاوکردن پێویستە لە هێلانەکەی دەربچێتە دەرەوە و لە هێلکەکانی دوور بکەوێتەوە، بەڵام هەرگیز ئەو کارە ناکات، ناتوانێت بیکات.

دوای تێپەڕبوونی چەند مانگێک، هەشتپێ دایکەکە برسی و لاواز و ماندوو دەبێت. لەبەر ئەوەی لە ژێر سەدان مەتر قووڵایی دەریادا پلەی گەرمی زۆر نزمە، گەرمی جەستەی ئەو دایکەکە کە هیچ ناخوات و هیچیش ناجووڵێت، دادەبەزێت. جووڵەکانی زۆر هێواش دەبنەوە. لە ڕاستییدا ئەمە شتێکی باشە؛ چونکە بەم شێوەیە پێویستی بە خواردن بۆ نزمترین ئاست دادەبەزێت. ئەگەر پێش تروکانی هێلکەکانی و سەردەرهێنانی بێچووەکانی گەیشتە ئاستێک نەتوانێت بەرگەی برسێتی بگرێت، چەند دانەیەک لە قۆڵەکانی خۆی دەخوات.

لە کۆتاییدا کە ماوەی دیاریکراو تەواوبوو، لە هێلکەکانەوە بێچووی هەشتپێ یەک بە یەک سەر دەردەهێنن. کاتێکیش هەموو هێلکەکان تروکان و گشت بێچووەکان هاتنە دونیاوە، هەشتپێ دایکەکە ئەرکەکەی کۆتایی پێ دێت. پێش ئەوەی گەورەبوونی هیچکام لە بێچووەکانی ببینێت، لە شوێنی خۆیدا دەمرێت.

لە ژێر قووڵایی سەدان مەتری دەریا قووڵەکاندا، لەم نیشتمانە تاریک و ساردەدا کە تەنانەت تیشکی خۆریشی پێ ناگات، یەکێک لە هەرە گەرمترین چیرۆکەکانی دایکایەتی دەگوزەرێت.

بەرامبەر ئەوانەی دەڵێن: "ژیان هەوڵ و خەباتێکە! هەمـووان بیر لە گیـانی خۆیـان دەکەنەوە! بەهێزەکـان دەژیـن، لاوازەکـان دەمــرن و دەڕۆن! سروشـــت دڕنـــدەیە، بێبەزەیـــیە!" کاتێـــک نەرمۆڵەیەکی دەریایی سەیروسەمەرە لە پۆلی سەرپێیەکان دەبێـتە دایک، لەپێنـاو ئەو بێچـووانەی کە تەمەن ڕێـگە نـادات چـاوی پێیان بکەوێت، گیـانی خـۆی دەکـاتە قوربـانیی. ئەو بەزەیـی و میهرەبانییەی لەو سێ دڵە گەورەیەیدایە دەڵێت: "ئەگەر ڕەحـمان و ڕەحـیم نەبێـت کە منـی بەدیهێنـاوە، لە منیشــدا ئەم بەزەیــیە نەدەبوو، هەروەها ئەم میهرەبانیەش!"



# چاوت دابخە و دەمت بکەرەوە!



یەکێک لەو چیرۆکە ترسناکانەی بە منداڵی گوێم لێ دەبوو، ڕفاندنی دوو منداڵ بوو لەلایەن ورچێکەوە.

گوایە ورچێک کە بەچکەی نەبووە، زیاتر بەرگەی ئەو بێبەچکەییەی نەگرتووە و ویستوویەتی بەچکەیەک بۆ خۆی پەیدا بکات، بەڵام لە دارستاندا ئاژەڵێکی لە ڕەگەزی خۆی بەدی نەکردووە بێچووەکەی بدزێت و بەخێوی بکات. ئا لەو ڕۆژانەدا خێزانی پیاوە داربڕەکە دووانەیەکی بووبوو!

ورچەکە گوێی لە قیژە و گریانی کۆرپەکان بووبوو، وتبووی: "ئەوەتا ئەو بێچووانەی بەدوایدا دەگەڕام دۆزیمەوە!"

شەوێک ورچەکە دەچێتە ماڵەکە و هەردوو منداڵەکە لە بێشکە دەهێنێتە دەرەوە و دەیانبات بۆ ئەشکەوت.

لەو سەردەمەدا، کاتێک گوێم لە چیرۆکی لەو شێوەیە دەبوو، بە خەیاڵمدا نەدەهات بڵێم: "ها! شتی وا نابێت!" بە خەیاڵیشمدا بهاتایە وا بەئاسانی نەمدەتوانی بیڵێم. چونکە ئەوەی چیرۆکەکەی دەگێڕایەوە، بە شێوەیەک دەیگێڕایەوە، کە لە ڕاستییدا ئەگەر باوەڕم بە یەک وشەشی نەکردایە، نەمدەتوانی

چیرۆکەکە تێکبدەم و چێژەکەی نەهێڵم، لەبەر ئەوە تا کۆتایی گوێم لێ دەگرت، وەک ئەوەی چووبێتم بۆ سینەما و تەماشای فیلمێکی خۆش دەکەم، بە تاسەوە گوێم لێ دەگرت.

بێگومان ناو بە ناو هەر پرسیارم دەکرد، ئەوەیان جیا بوو:

- ئێ دەبا یەکێکیانی بۆ دایکی جێ بهێشتایە! بۆچی هەردووکیانی هەڵگرتووە و بردوونی؟

- ئاخر دڵی نەهاتووە ئەو دوو برایە لە یەکتر جیا بکاتەوە!

- ئای لەوە، دڵی نەهاتووە ئەو برایانە لە یەکتر بکات، بەڵام دڵی هاتووە داربڕ و ژنەکەی لە منداڵەکانی بکات!

- لەوانەیە ورچەکە ئەوەندە بەوردی بیری نەکردبێتەوە!

- ئێ، دوایی چی ڕووی دابوو؟

دوایی چی بووە؟ گوایە ئەم ورچە بێویژدانە، منداڵەکانی بردووە بۆ ئەشکەوتەکە، وەک بێچووی خۆی بەخێوی کردوون و گەورەی کردوون، شیری خۆی پێ داون. لەبەر ئەوەی شیری ورچەکەیان خواردبوو، منداڵەکان لە ماوەیەکی کورتدا گەورە بوون و وەک ورچیان لێ هاتبوو! ئاخر شیری ورچ ڤیتامینی زۆری تێدایە و چەورە. بێگومان ئەگەر باوەڕ بە وتەی نەنکم بکەن.

- نەنە! ورچەکە چۆن شیری بە منداڵەکانی دەدا؟ ئاخر ورچ مەمکی هەیە؟

- بەڵێ بێگومان هەیەتی، تۆ بڵێی نەبێت؟

- ئەها دەی باشە، ئەی دوایی؟

دوایی چی بوو؟ ئیتر لەوە بەدواوە، بەگشتی چیرۆکەکە کەمێک بەپێی تاقەتی ئەو کاتەی نەنکم دەبوو.

هەندێک جار بەکورتی دەیبڕیەوە و دەیوت: "داربڕەکە هات، منداڵەکانی دۆزیەوە، ورچەکەی کوشت. پێستەکەی بەجوانی گووری. ژنی داربڕەکەش پڕی کردبوو لە گیا و کردبووی بە سەرین، بەڵام منداڵەکان بەهۆی ئەوەی ورچەکەیان بە دایکیان زانیبوو، هەرگیز لە داربڕەکە خۆش نەدەبوون"، ئینجا کۆتایی پێ دەهێنا.

هەندێک جاریش دەیوت: "کەستانە فرۆشێک، لە کاتێکدا لە دارستانەکەدا سەرقاڵی کۆکردنەوەی کەستانە بووە، منداڵەکانی دۆزیوەتەوە و ڕزگاری کردوون."

- دوایی؟

- کوڕم، دوایی نییە، چیرۆکەکە تەواو بوو!

- ئێ دە باسی کە! زیاتر بگێڕەوە!

- گیانەکەم، نوێژەکەم دەچێت.

- نەنە گیان، دە خۆ تازە بانگی داوە، دە دەی توخوا! دە با مامۆستا لە منارەی مزگەوتەکە دابەزێ، ئەوسا نوێژەکەت بکە!

- ئای ئەم بێمێشکە چەند لە خاڵوانی دەچێت!

- جا ئەوە چ پەیوەندییەکی هەیە! خۆ من دەچم بۆ نوێژی هەیینی، خۆ ئەوان بۆ ئەوەش ناچن!

ئەگەر ئەوەندە زۆری بکەن، هەرگیز ناتوانن پێشبینی بکەن چیرۆکەکە بە کوێ دەگات. ئیدی هەرچیەک بێت پێویستە بە کۆتاییەکەی ڕازی بن.

- دوایی، کەستان فرۆشەکە کچێکی جوانی هەبوو، ئەم دوو برا دووانەیە عاشقی ئەو کچە جوانە بوون. لەبەر ئەو کچە پەلاماری یەکتریان دەدا. یەکێکیان سەر سەری ئەوی دیکەیان کەوت، بە دار کێشای بەسەریدا و سەری براکەی بریندار کرد و وەک شووتی شەقی کرد.

- نا وا نەڵێی!

- ئێ ئاخر هەر لە سەرەتاوە شیری ورچییان خواردووە، بەوە گەورە بوون!

من دووبارە نەمدەپرسیەوە و بڵێم: "ئاخر ئەو منداڵانە کەی وا گەورە بوون و عاشقی کچی کەستانە فرۆشەکە ببن؟" نەنکم دەیگێڕایەوە و منیش گوێم دەگرت. ئاخر زۆر جار بە شێوازی زۆر زۆر جیاواز گوێم لەم چیرۆکە بووە. لە هەموو جارێکدا هەمان پرسیارم لە نەنکم دەکرد، چێژێکی زۆرم لێ وەردەگرت.

- ئەگەر بە منداڵی منیان بڕفاندایە، حەزم دەکرد مانگا بمفڕێنێت نەک ورچ.



- لەبەر چی؟

- ئاخر بێز لە شیری ورچ دەکەمەوە! لەبەر ئەوە هیچ نەبێ شیری مانگام دەخواردەوە.

- ئای زۆرزان!

- هاهاهاهاهاها

کاتێک گوێم لەم چیرۆکە ترسناکانە دەگرت کەیفخۆش دەبووم، بەڵام کاتێک شەو دەچوومە جێگەی نووستن، هەموو شتەکانم دەهاتنەوە بەرچاو، جا شیرخواردنی منداڵەکان لە مەمکی ورچە سنگ توکناویەکە، ئینجا توند چاوم دادەخست و هەوڵم دەدا بەخێرایی خەوم لێبکەوێت.

لە ڕاستییدا ورچەکانیش وەک هەموو شیردەرەکان کە شیر بە بێچووەکانیان دەدەن، زۆر جوانن، شتێکی زۆر خۆش و ژیرانەیە. بێگومان ئەگەر بێچووە ورچێک بن، چونکە وەک چۆن هەموو دایکێک بێچووەکەی بەلاوە جوانە، هەموو

بێچوویەکیش دایکـی بەلاوە جـوانە و شـیری دایکـی خـۆی بە لاوە شیرینە.

بـۆ نمـوونە، ئەگەر ئەسـپی ئـاوی ئەو منـداڵە دووانەیەی داربڕەکەی بڕفاندایە، ئەوانی بە شیرێکی ڕەنـگ پەمەیـی بەخێـو دەکرد، چونکە شیری ئەسپە ئاوییەکان پەمەییە و تامەکەشـی بـۆ بێچووەکەی خۆی باشترینە.

باشـە، ئەی ئەگەر ئەو دوو منـداڵە دووانەیە حـاجی لەقـلەق بیفڕاندنایە؟

وەک دەزانن باڵندەکان شیردەر نین و بێچووەکانیـان بە شـیر بەخێو ناکەن. ئەگەر حاجی لەقلەقێک ئێـوەی بەخێـو بکـردایە، نانی بەیانیتان بۆق یان مارمێلکە دەبوو، لە ژەمی نیـوەڕۆدا، کـرم و شلەی کرمەلیقەی لە قاوغەکەی بۆتـان دەردەهێنـا ، بـۆ نـانی ئێوارانیش ناچار دەبـوون مـارێکی کـوڵە کـوێرە بخـۆن، ئیـدی نسیبتان هەرچیەک بێت.

جـا ئەگەر لەلایەن کونەپەپـوو، هەڵـۆی کوللەخـۆر یـان بازێکەوە بەخێو بکرانایە، ئەوا لیستی سـەرەکیی خوانەکانتـان لە ئاژەڵە قرتێنەرە بچووکەکانی وەک مشک و سـمۆرە پێکـدەهات. بەڵام خەم مەخۆن، ئەو باڵنـدە ڕاوکەرە دڕەنـدانە؛ نێچیرەکانیـان هەروا ناخەنە دەمی بێچووەکانیانەوە، بەڵکو بەو پەنچە تیژانەیان دەیـانگرن و بەو دەنـووکە تیژانەیـان پـارچە پـارچەی دەکەن و پاروو بە پاروو دەیکەن بە دەمی بێچووەکانیانەوە.

بیر لەوە بکەنەوە، ئەگەر لەلایەن باڵندەیەکی بچووکی وەک چۆلەکەی پاسارییەوە بەخێو بکرانایە، ئەوا دەبوو ئامادەبن بۆ خواردنی هەرچی مێرووی سەر ئەم هەسارەیە -بە مردووی بێت یان بە زیندوویی- چونکە خواردنی سەرەکیی ئەم چۆلەکەیە مێرووەکانە لەگەڵ کرمە بچووکەکان، بێگومان کرمی خرپن، هیوادارم چێژەکەی بۆتان گونجاو بێت و کرمی ئاوریشمی بێت!

چی بوو؟ کەسێک خەریکە دەڕشێتەوە؟ ئادەی خێرا ڕاکەن عەلاگەیەکی فریاخەن و با ئەو ناوە پیس نەبێت!

هەموو ئەوانەی باسم کردن ڕەنگە ببێتە هۆی دڵتێکهەڵاتنتان. بەڵام هیچ کات ئەوە لە بیر مەکەن: لەم جیهانەدا ئەوە تەنیا ئادەمیزادەکانن -جا چ بچووک بن یان گەورە- لچ هەڵدەقرچێنن بۆ ئەو ڕزقەی دێتە بەردەمیان.



نە بێچووی ورچ بەلالووتن لە شیری دایکیـان، نە بێچـووی ئەسپی ئـاوی نووزەنـووز دەکەن و بڵـێن: "لەبەر ئەوەی ڕەنگـی پەمەییە وامـان زانـی شـلیکە، بەڵام شـلیک نیـیە؟" نە بێچـووی باڵندەکان هەر لە حاجی لەقلەقـی دەنـووک زلەوە تـا پاسـاریی بچووک هیچ کامیـان نـاڕەزایی بەرامـبەر ئەو خواردنـانە نیشـان نـــادەن کە لەلایەن دایکیـــانەوە لە شـــاخ و داخ و دەوەنە دڕکاوییەکان بە هەزار دەردەسەری و یەک بەیەک کۆ دەکـرێنەوە و دەخرێتە بەر دەنووکیان، جـا خـۆراکەکە مـارێکی پـڕ پـرۆتین بێت، بۆقێک بێت یان مێرووەکان بێت پێی ڕازین.

خودای گەورە کە گونجـاوترین دەم و شـیاوترین دەنـووکی پـــێ بەخشـــیون، بە دەســـتەکانی دایکیـــان شایســـتەترین و گونجاوترین خۆراک بۆ گەدەیان دەنێرێت کە کـاری هەمەجـۆر دەکەن و هەموویان بەجوانی تێر دەکات.

ناوی ڕەزاق، کە بە واتای ڕۆزیدەری بەدیهێنراوەکەی دێـت، کە هەمـوو جـۆرە خـواردنێکی بەدیهێنـاوە، سـەر ڕووی زەوی وەک سفرەیەک بە هێندەی زەوی خۆی دەڕازێنێتەوە لە خۆراکی هەمەجۆری جیاواز و میوەی شیرینی وەک هەنگوین.

چونکە ئەو زاتەی ئەو هەمـوو جـۆرە دەم و دەمـار و ددان و گەدەی بەدیهێناوە، گونجاوترین خواردنیشی بۆ بەدیهێناوە.

# وردەکارییەکانی ماسی خواردن

شینە شاهۆکان کە ماسی دەرخـواردی بێچووەکانیـان دەدەن و بەوە بەخێویـــــان دەکەن، بە بەراورد بەوانەی وشـــــکانی کە بەدوای خواردنــدا دەگەڕێـن بـۆ بێچووەکانیـان زیـاتر بەرچـاو دەکەون.

بەڵام خــواردنی ماســی کۆمەڵێــک وردەکــاری هەیە. ئەو دایکانەی دەیانەوێت ماســی دەرخـواردی منـداڵەکانیان بـدەن، ئەمە زۆر باش دەزانن.

ئەگەر ماسـییەکی بچـووکی وەک حامسـی (Anchovy) کە دڕکەکــانی بچــووکە دەرخواردیــان بــدەن، ئەوا پێویســتە ئەو دڕکانەیان کە وەک دەرزی وان یەک بە یەک دەربهێنن.

بەڵام ئەگەر ماسی گەورەتری وەک ماسی بۆنیتـۆ (bonito) و سەلەمۆن دەخۆن، ئەوا کێشە نییە. بێ نان بیکەن بە دەمیەوە.

بێگومان ئەگەر لەدوای یەکەم پاروو پیاتاندا نەڕشـێتەوە، ئەوا هەموو شتێک بە دەمیدا دەکەن!

شـــینە شـــاهۆکان هەمـــوو ماســـییەک کە دەیگـــرن، بـــۆ بێچووەکانیان نابەن و دەرخواردیان نادەن.

بـــۆ ئەو بێچووانەیـــان کە تـــازە لە هـــێلکە هـــاتوونەتە دەر، بچووکترین ماسی، دروسـتتر بڵـێم: بێچـووە ماسـییەکانیان بـۆ

دەبەن. ئەم باڵندە بچووکە تەنیا دەتوانێت ماسییەکی بچووک کە درێژییەکەی یەک دوو سانتیمەترە قووت بدات.

لەگەڵ گەورەبوونی باڵندەکە، ئەوا ژمارە و قەبارەی ئەو ماسییانەی شینە شاهۆ دایکەکە بۆ هێلانەکەی دەیبات، زیاتر دەبێت.

باڵندەکانی ماسیگرە (شا ماسیگر). کە ئەویش ماسی دەرخواردی بێچووەکانی دەدات، کاتێک نێچیرەکانی ڕاو دەکات، کلکیان دەگرێت و بە ساغی بۆ هێلانەکەی دەباتەوە و ماسییەکە سەرەوخوار دەرخواردی بێچووەکانی دەدات، چونکە ماسییەکە هەرچەندە بچووک بێت، بێچووە باڵندەکە ناتوانێت ماسییەک لە کلکیەوە قووت بدات بە پێچەوانەی ئاڕاستەی ئێسکەکانی. ئەگەر شێوەی ماسییەک بهێننە بەرچاوی خۆتان، باشتر لە مەبەستم تێدەگەن.

- هێنامە بەرچاوم، بەڵام تێنەگەیشتم!
- گیانەکەم، کام ماسییەت هێنایە بەرچاوت؟
- قرش!
- وا بزانم ماوەیەکی زۆرە ماسی ناخۆیت!
- بە چیدا زانیت؟
- تۆ فسفۆرت دابەزیوە! ئاخر فسفۆر بۆ مێشک زۆر گرنگە.

هەرکەسێک ئێسکی ماسی لە قورگی گیرابێت، دەزانێت کە ئەم بابەتی ماسییە چەندە گرنگە.

شتێکی زۆر خراپە.

باڵندە ژێر دەریاییەکان بۆ ئەوەی بێچووەکانیان دووچاری کێشەیەکی لەو شێوەیە نەبن، فێری ڕێوشوێنێکی نائاسایی کراون.

کاتێک بێچووی باڵندەی ژێردەریایی بچووک لە هێلکە دێنە دەرەوە، دایکیان سەرەتا گەندەپەڕی سنگی خۆی کە لێی دەکاتەوە یان ئەو گەندەپەڕانەی لەسەر ئاوەکە کۆیان دەکاتەوە، دەرخواردیان دەدات! بێچووەکان ناتوانن ئەو پەڕانە هەرس بکەن و لەناو گەدەی بچووکی بێچووەکان و لەسەر ڕێگای کراوە بە ڕووی ڕیخۆڵەکاندا کەڵەکە دەبن. بەم شێوەیەش کاتێک بێچووەکان ماسی دەخۆن ئەوا ئێسکی ماسییەکان کە هەرس نابن بەو تۆپەڵەیە دەگیرسێنەوە و زیان بە گەدە و ڕیخۆڵەکانی ناگەیەنن!

# چەقەڵێکی دایکە لە بیابانی نامیب

بیابانی نامیب، کە دەکەوێتە سنوورەکانی نامیبیا لە ئەفریقـای باشوور و جـوانییەکەی بێهـاوتەی هەیە، لەوانەیە یەکێـک بێـت لەو شوێنانەی ژیان تیایـدا سـەختترینە، بەڵام کەناراوەکـانی ئەم وڵاتە بەرینە بێپیتە کە لەگەڵ زەریـای ئەتڵەسـدا یەک دەگرێـت، دیمەنێکی جوان و قەشـەنگ دەدات بەو کەسـانەی دەیانەوێـت ئاوێتەبوونی بیابان و زەریا ببینن.

لە بیابانی نامیبدا، چەندین ئاژەڵی جیـاواز لە یەکـتر دەژیـن. بەناوبانگترینیان میرکاتەکانن کە زۆر بەیەکتریـیەوە پەیوەسـتن و بە خێزانــی قەرەبــاڵغ دەژیــن، لەگەڵ چەقەڵــی پشــت ڕەش کە هەردەم بە دوای میرکاتەکاندا ڕا دەکەن.

لە نامیب، دۆزینەوەی خۆراک زۆر سـەختە، بەڵام تەنـانەت لەم وڵاتە بێپیـــتەدا، هەمـــووان بە ڕێگـــای هەمەجـــۆری سەرسوڕهێنەر ڕۆزی پەیدا دەکەن.

چەقەڵە پشت ڕەشەکان، وەک هەمـوو شـیردەرەکانی دیـکە، بۆ ماوەیەک بێچووەکانیان بە شـیر بەخێـو دەکەن، بەڵام هەر کە لە شیر بڕانەوە و دەستیان بە خـواردنی خـۆراکی تەواوکەر کـرد، چەقەڵــی دایــکە وەک هەمــوو دایکــانی ســەر ڕووی زەوی،

ئەرکێکی سەخت چاوەڕوانی دەکات، ئەویش تێرکردنی سکی بێچووەکانێتی زیاتر لە سکی خۆی.

بەخێوکردن و تێرکردنی بێچووەکان سەختە، جا ئەگەر چەقەڵێکی پشت ڕەش بن و لە بیابانی نامیب بن، ئەوا زۆر سەختترە.

چەقەڵەکان ڕاوچی باش و فێڵبازن، بەڵام ڕاوکردنی میرکاتەکان کە لەو ناوەندەدا زۆرن، هیچ ئاسان نیین.

بەڵام چەقەڵێکی دایکە کە بێچووەکانی لە هێلانەکەدا لە برساندا دەلوورێنن، ناتوانێت بە دەستبەتاڵی بۆ هێلانەکەی بگەڕێتەوە.

کاتێک چەقەڵە دایکەکە لە ڕاوکردنی میرکاتەکان بێ ئومێد دەبێت، ئاڕاستەکەی بەرەو کەناراوی بیابانە بەرینەکە کە لەگەڵ شەپۆلەکانی زەریادا یەکدەگرێتەوە، دەگۆڕێت.

بێگومان لەم کەناراوانەدا کە سەدان هەزار سەگی دەریایی چەور لەسەر پشت خۆیان خستووەتە بەر خۆر، چەقەڵەکە نێچیرێکی دەست دەکەوێت بۆ بێچووەکانی بباتەوە.

بۆ ڕاوکردنێکی لەم شێوەیە، چەقەڵە دایکەکە ملی ڕێگایەکی ٣٠-٤٠ کیلۆمەتری دەگرێتە بەر. کاتێک دەگاتە کەناراوەکە، وا مەزانن کە یەکەم سەگی دەریایی بینی کلکی دەگرێت و دەتوانێت بە ڕاکێشان بۆ هێلانەکەی و بۆ بێچووەکانی بباتەوە.

سەگە دەریاییەکان، ئاژەڵانێکی زۆر گەورەتر و قورسترن لەوەی چەقەڵێک بتوانێت ڕاویان بکات.

لەبەر ئەوە چەقەڵەکە یان دەبێت بێچوویەکی سەگی دەریا بدۆزێتەوە کە لە دایک و باوکی دوور کەوتووەتەوە، یانیش سەگێکی دەریای تۆپیو بدۆزێتەوە.

لە هەردوو دۆخەکەدا، چەقەڵەکە ناتوانێت ئەو خواردنەی دەستی کەوتووە لەگەڵ خۆی بۆ ئەو مەودا دوورە بباتەوە، لەبەر ئەوە چەقەڵە دایکەکە ئەوەندەی بتوانێت لێی دەخوات تا تێر تێر دەبێت و گەدەی جێگەی یەک پارووی دیکە ناگرێت، پاشان ڕێگای ماڵەوە دەگرێتە بەر.

کاتێک دەگاتەوە هێلانەکەی، بێچووەکانی کە چاو لە ڕێی بوون، دەورەی دەدەن بزانن چی بۆ هێناونەتەوە. دایکەکە بە دەستبەتاڵی گەڕاوەتەوە، بەڵام گەدەی بەتاڵ نییە، هەموو ئەوەی خواردوویەتی دەیهێنێتەوە، واتە: دەیڕشێنێتەوە. بێچووەکانی کە ئەمە دەبینن، لە خۆشیدا هەڵدەبەزنەوە و بە دەوری دایکیاندا دێن و دەچن، چونکە ڕشانەوەی دایکەکە، ژەمێکی نیوە هەرس و ئاسان و بەسوودە بۆ خواردنی بێچووە چەقەڵەکان.

ئەگەر تەماشای هەڵپەی بێچووەکانی چەقەڵی پشت ڕەش بکرێت، کاتێک خواردنەکە دەخۆن، خۆراکەکە زۆر بەتام دیارە.

بێگومان بۆ بێچووی چەقەڵی پشت ڕەش.

لەگەڵ ئاوابوونی خۆر لە بیابانی نامیب، لـوورەی چەقەڵـی دایـک بـاڵ بەسـەر ئەو خـاکە بێپیـت و بەرهەمەدا دەکێشـێت. ئەمەیـش جـگە لە سوپاسـگوزاری دایکێـک لە دایکەکـان بە زمانحـاڵی خـۆی بـۆ خـودای گەورە هیچـی دیـکە نیـیە، کە ڕۆژێکـی دیـکە ڕۆزی پـێ بەخشـیوە بـۆ تێرکردنـی سـکی بێچووەکانی.

# دایکان هەمیشە فریادڕەسن!



بۆ ئەوانەی لە نیوەگۆی باکووری ئەم هەسارە خڕە جوانەدا دەژیـــن، ئانتارکتیکـــا، نیشـــتمانێکە لەوپەڕی زەویـــدایە و کیشـــوەرێکی بەســـتەڵەکی گەورەی شـــین- ســـپی و ســـاردە. لە ڕاســـتییدا کاتێـــک پێناســـەی ئانتارکتیکـــا دەکرێـــت، بەتەنیـــا بەکارهێنانی وشەی سارد بۆ ناساندنی بەس نیـیە، ئەگەر بڵێـین: "زۆر زۆر زۆر زۆر سارد" ڕەنگە کەمێک باشتر بێت.

لە خۆشترین ڕۆژی هاویندا، پلەی گەرما لە ئانتارکتیکا پانزە پلە ژێر سفری سەدییە (-١٥C°)، لە وەرزی زســتاندا، کە لەگەڵ مانگی ئادار دەست پێ دەکات، بەئاسانی دەگـاتە ٥٠ پـلە ژێـر سفری سەدی (-٥٠C°).

لە خۆشترین ڕۆژی هاویندا، پلەی گەرما لە ئانتارکتیکا پانزە پلە ژێر سفری سەدییە (-١٥C°)، لە وەرزی زســتاندا، کە لەگەڵ مانگی ئادار دەست پێ دەکات، بەئاسانی دەگـاتە ٥٠ پـلە ژێـر سفری سەدی (-٥٠C°).

کەمێک پێش ئێستا لە ڕێگەی بەرنامەیەکی مۆبایلەکەمەوە تەماشای پلەی گەرمای ئانتارکتیکام کرد ٥٢ پلە ژێر سفری سەدی بوو (-٥٢C°).لە ئێستادا، پلەی گەرمای دهۆک ٢٣ پلەی سەدییە (٢٣ C°). واتە: ئانتارکتیکا ٧٥ پلە لە دهۆک ساردترە (٧٥ C°)! بەڵام سەدان هەزار ساڵە لەم نیشتمانە بەستەڵەکە شین-سپیەدا ئەم سەرما زۆر زۆر ساردە نەیتوانیوە ببێتە ڕێگر لە ڕوودانی گەرمترین و خۆشەویستترین چیرۆکەکانی سەر ڕووی زەوی.

پەنگوینەکان کە دانیشتوانی ڕاستەقینەی کیشوەری ئانتارکتیکان، لە کەناراوەکانی ئەم نیشتمانە بەستەڵەکەدا دەژین.

جگە لە ماسی و ڕۆبیان، بژاردەیەکی زۆریان بۆ خواردن نییە.

بەڕوونی دیارە کە باڵە کورتەکانیان بۆ فڕین بەدینەهێنراوە، بەڵام ئەو باڵە کورت و تیژانەیان بۆ مەلەکردن نایابە. لە ناو ئاودا بە هێندەی ماسییەکان خێرا مەلە دەکەن، بۆ چەندین خولەک هەناسەیان دەگرن و بەئاسانی دەتوانن بچنە قووڵایی سەدان مەترەوە.

بەڵام کاتێک دێنە وشکانی، دروستتر بڵێم: دێنە سەر سەهۆڵ، ناچارن بەو هەنگاوانەی هەمووان دەیبینین، بە خلەخل بە پێ بڕۆن بۆ ئەو شوێنەی دەیانەوێت بچن. کاتێک

لێژاییەک بۆ خوارەوە هاتە سەر ڕێگەیان، هەرگیز ئەو دەرفەتە لەدەست نادەن و لەسەر سک پاڵ دەکەون و بە خلیسکێنە دەچنە خوارەوە.

هەرچەندە شێوازەکانی ڕۆیشتنی پەنگوینەکان لای ئێمە قورس و سەخت و کەمێک کۆمیدی دەرکەوێت، بەڵام لای ئەوان بە سوودترین شێوازە کە جەستە خرپنەکەیان لە شوێنێکی خلیسکی وەک سەهۆڵ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بەئاسانی و بە کەمترین وزە دەگوازێتەوە.

## "Winter is coming!"

## "وا خەریکە زستان دێت!"

بەهـۆی ئەوەی ئانتارکتیکـا دەکەوێـتە نیوەگـۆی باشـووری زەوی، مانگی ئادار تیایدا بە واتای هاتنی وەرزی زسـتان دێـت، نەک بەهار. هەست دەکەم دەڵێن: "لە نیشـتمانێکی بەسـتەڵەکدا هاوین بێت چییە و زستان بێت چییە؟"ئەگەر دەگونجێت بـا لەو پەنگوینانە بپرسین، چونکە ئەوان زۆر باش ئاگادارن و دەزانن.

لەگەڵ هـــاتنی وەرزی زســـتاندا، کەناراوەکـــانی زەریـــای کیشوەرەکە بەخێرایی دەیبەستن و بە پانـایی چەنـدین کیلـۆمەتر چینێکی سەهۆڵ دەورەی دەدات.

کاتی هێلکەکردنی پەنگـوینە مێیەکـان ڕێـک هاوتـایە لەگەڵ ئەو کـــاتەدا، بەڵام پەنگوینەکـــان هەرگیـــز لەســـەر ئەو چیـــنە سەهۆڵەی ئەم وەرزە هێلکە نـاکەن، جـا هەرچەنـدە ئەسـتوور و فراوانیش بێت، ئەویش بەهۆی زریانە مەترسیدارەکانەوە کە زوو زوو چیـــنە ســـەهۆڵەکان دەتەقێنێـــت و درزی گەورە و دۆڵـــی کوشندەی قووڵیان تێدا دروست دەکات.

هەزاران پەنگوینی نێر و مـێ، بەرەو نـاوەوەی کیشـوەرەکە و بۆ ناوچە ئارامەکانی هێلکەکردن دەست بە گەشـتێکی سـەخت دەکەن.

ڕۆیشتن بۆ ناوچەی ئارامی زاوزێکردن، واتە: گەشتێکی سەختی نزیکەی ١٠٠-١٢٠ کیلۆمەتری لە ناوەڕاستی زستاندا.

سەختترین بەشی ئەم کارە لەوەدایە، لەسەر ڕێگای پەنگوینەکاندا کە لە کەناردەریاکە دوور کەوتوونەتەوە، هیچ شوێنێک نییە پشووی تێدا بدەن و کەمێک ماسی و ڕۆبیان بخۆن و سکیان تێر بکەن. لەبەر ئەوە چەند ڕۆژێک پێش گەشتەکە زۆر باش خۆیان تێر دەکەن، پێش ئەوەی بەڕێ بکەون بۆ دوایین جار خۆیان فڕێ دەدەنە ناو ئاوە ساردەکانی ئەو زەریا بەبەرەکەتەوە، ئەوەندەی بتوانن سک و چیکڵدانەیان پڕ دەکەن.

کە کاتی دەرچوونیان هات، هەزاران پەنگوین وەک سەربازانی سوپایەک کە لە یەک شوێنەوە فەرمانیان وەرگرتووە، یەک لە دوای یەک بەڕێکوپێکی ڕیز دەبن و ڕێپێوانە گەورەکە دەست پێ دەکات.

ئەو شوێنەی پەنگوینەکان بۆی دەچن، هەرگیز جێگیر نییە، ئەم نیشتمانە بەستەڵەکە، هەر وەک شاخە لمیەکانی بیابانی مەزن یان سەحارا کە بەهۆی کاریگەریی ڕەشەباوە لێرەوە بۆ ئەوێ دەگوازرێنەوە، ساڵانە دەگۆڕێن و چیا و دۆڵ و دیواری سەهۆڵی دروست دەبێت کە پێشتر نەیانبینیوە.

پەنگوینەکان لەبەر ئەوەی ناتوانن بفڕن، هەمیشە ناچارن تەواوی ئەو بەربەستانە بە گەڕان بە دەوریاندا ببڕن. ئەمەش

گەشتەکەیان کە خۆی لە هەلومەرجی زۆر سەختدا بەڕێوە دەچێت، قورستر دەکات. بەڵام هیچ کات ناگەڕێنە دواوە، کەسیشیان ڕیزەکە تێکنادەن. شەو یان ڕۆژ، ئەو ڕەشەبا توندانەی بەهۆی کاریگەریی سەرماوە چەند هێندە زیاد دەکات و زریانی بەفر کە تیایدا چاو چاو نابینێت، ئەوان پاشگەز ناکاتەوە و لەو گەشتەیان نایانگەڕێنێتەوە.

باشە، بەڵام چۆن ڕێگاکەیان دۆزییەوە؟ چۆن هیچ سەریان لێ تێکناچێت؟ ڕاستییەکەی ئەوەیە زانایانیش بە تەواوی ناتوانن ئەوە ڕوون بکەنەوە.

هەندێکیان بۆ خۆدەربازکردن دەڵێن: ئەوە لەخۆوە و سروشتییە. هەندێکیان دەڵێن: ئەستێرەکان ڕێگا نیشانی پەنگوینەکان دەدەن، هەندێکیشیان دەڵێن: خۆر. هەیشە دەڵێت: "لەبەر ئەوەی چەندین نەوەیە گەشتێکی لەم شێوەیە دەکەن، ڕەنگە لە ناخیاندا قیبلەنمای شاراوە هەبێت"، منیش لەو کەسانەم کە باوەڕیان وایە وەک چۆن پەروەردگاری جیهانیان، لە بەدیهێنانەوە دوو باڵی نایابی مەلەکردنی بەم بەدیهێنراوە خۆشەویست و بەئەمەکە بەخشیوە تا لەناو ئاودا مەلەی پێ بکەن، پێستێکی ئەستووری پەڕاوی نائاسایی پێ بەخشیون تا لەم نیشتمانە سارد و کوشندەدا بیانپارێزێت و بە گەرمی بژین، بەم شێوەیەش، توانای دۆزینەوەی ڕێگاشی پێ بەخشیون،

چونکە بە باوەڕبوون بە قیبلەنمایەکی نەبینراو، بـاوەڕ دەهێـنم بە بەدیهێنەرێک کە چاوەکـان نـاتوانن ببیـنن، بەڵام ئەو مـوعجیزە بێشومارانە دەبینن کە لەسـەر زەوی و ئاسـمانەکان بەدیهێنـاوە و هەموو شتێک بە فەرمان و بە بەدیهێنـانی ئەو زاتە ڕوو دەدات و هیچ شتێک ناتوانێت لە خۆیەوە ڕوو بدات.

## ناوچەی دڵنیا

دوای چەند هەفتەیەک، ئەو هەزاران پەنگوینەی لە کەنـاراوە جیاوازەکانی ئانتارکتیکاوە کۆچیان کـردووە، لە کۆتاییـدا دەگەن بەناوچەی زاوزێی ئارام و دڵنیا کە بۆیان تەرخان کراوە.

ئەو ناوچەیە شوێنێکی بـاش و سـەلامەتە بـۆ هێلکەدانـان و بـوونە خـاوەنی هـێلانەیەک، هەروەهـا دوورە لە باڵنـدە ڕاوکەرەکانی کەناری زەریا و ماسییە گەورە گۆشـت خۆرەکـانی زەریاکە. هەروەها شـوێنێکی دابـڕاوە -کە ئەگەر بـۆ کەمێکـیش بێـت- دەیانپارێزێـت لەو ڕەشـەبایانەی لەگەڵ نزیکبـوونەوەی وەرزی زستاندا بەهێزتر هەڵدەکەن.

ئەو زانایـانەی لە دوای مـاوەیەکی کەم لەنێـو لوورەلـووری ڕەشـەبا و کرتەکرتـی شـکانی چینـی سـەهۆڵەکە بە مەبەسـتی ئەنجامـدانی تـوێژینەوە هـاتوون، یـان بە زۆر بـۆ ئانتارکتیکـا

نێـردراون، لەنێـو ئەو شـاخە سـەهۆڵانە و دۆڵە سـارد و دەشـتە سـپی-شـینانەی ئەم نیشـتمانە بەسـتەڵەکەدا کە جـگە لە نووزەنووزی ئەمانە نەبێت کە دەڵێن: "برا گیـان، ڕەق بـوومەوە! ئەریَ ئەمە چۆن وڵاتێکە!" هیچ دەنگێکی دیکە نایەت، ئـاواز و جریوەی پەنگوینە نێر و مێیەکان بۆ دۆزینەوەی هاوسەر، دەنـگ دەداتەوە.

چـونکە پێویسـتە هەمـووان بەپەلە هاوسـەرێک بـۆ خۆیـان بدۆزنەوە. لەبەر ئەوەی کاتیان زۆر نییە بەباشـی یەکـتر بناسـن. ئەمە لە جیهـانی پەنگوینەکانـدا بـوونی نیـیە شـەش مانـگ دەستنیشان کراو بێت، شەش مانگ دەستگیرانی و پاشان ئەگەر بووە نسیب پلانی هاوسەرگیرییەکە دابنرێت.

## یەک دەنگ بدە بەسە!

بەگشتی ئاژەڵەکان لە یەکـتر دەچـن. لە یەکەم تەماشـاکردندا ئەسـتەمە لە یەکتریـان جیـا بکەیـتەوە و بیانناسـیتەوە، بەڵام پەنگوینەکـان زۆر زیـاتر لە یەکـتر دەچـن. بێگومـان ئەمە هـیچ جیـاوازییەکی نیـیە بـۆ قرشـەکان یـان نەهەنـگە بکوژەکـان کە خوویان گرتووە بە ڕاوکردنی ئەم پەنگوینانە لە ناو ئاو یـان سـەر چیـنە سـەهۆڵەکان کە بە سنگەخشـێ و خلیسـکێنە دێـن و

پەلاماریان دەدەن، بەڵام بەڕاستی بۆ کەسێک کە ناچارە لەناو کاروانێکی پەنگویندا پەنگوینەکەی خۆی بدۆزێتەوە، زۆر ئەستەمە. لە ڕاستییدا تەنانەت پەنگوینەکان خۆشیان هاوسەرەکانیان بە دەنگیاندا دەناسنەوە، نەک شێواز و ڕوخساریان.




پێویستە هەموو یەکێکیان دەنگی هاوسەرەکەی بە باشی لەبیر بێت و لەوانی دیکەی جیا بکاتەوە، تەنانەت لە یەکەم پەیوەندیشدا. هەموو ئەم بانگکردنەی یەکتری، ئەم گۆرانی و ئاوازانە تەنیا بۆ ئەوە نییە ڕۆمانسی بێت؛ بەکورتی، لە کارەکەدا بە هێندەی خۆشەویستی لۆژیکیش بوونی هەیە!

# هێلکەی پەنگوین

لە کۆتاییدا، کە کاتی هێلکەکردن هات، پەنگوینە دایکەکـان بێ ئەوەی کات بەفیڕۆ بدەن، هێلکەکانیان دەکەن، پاشـان خێـرا بە دەنووکیان سەرەتا دەیخەنە سەر پێکانیان، دواتـر بەوریـاییەوە دەیخانە ناو ئەو توورەکەیەی هەڵهێنان کە وەک پێسـتێکی لـوول لە ژێر سکیدا بەدیهێنراوە.

ئەمە کارێکی زۆر زۆر گرنگە و پەنگـوینە دایـکەکە پێویسـتە پەلەی تێدا بکـات، چـونکە ئەگەر هـێلکەکە تەنـانەت بـۆ یەک خولەکیش لەسەر بەفرەکە بمێنێتەوە، دەیبەستێت و بێچـووەکەی ناوی کە هێشتا کۆرپەلەیەکی بچووکە (ئاوڵەمەیە) دەمرێت.

پەنگوینە نێـر و مێکـان دڵخۆشـن. لەبەر ئەوەی لە کـاتێکی نزیکدا یەکێکیان دەبێتە دایک و ئەوی دیکەیـان بە بـاوک. بەڵام هەردووکیـــان زۆر زۆر برســـین، لەبەر ئەوەی مـــاوەی چەنـــد مانگێکە تەنانەت یەک پارووش خۆراکیان نەخواردووە.

ڕەنگە پەنگوینە باوکەکە کەمێکی دیـکە بەرگەی ئەو برسـێتیە بگرێـــت. چـــونکە هێلکەکـــردن ڕێژەیەکـــی بەرچـــاوی وزەی پاشەکەوتکراوی دایکەکەی بەکار هێناوە. هەم برسـیە، هەمـیش مانـــدوو، لەبەر ئەوە پێویســـتە بـــێ ئەوەی زیـاتر دوا بکەوێـــت، شتێک بخوات.

# باوکە ئێشکگرەکان

پێویستە پەنگوینە دایکەکان بەپەلە شتێک بخۆن، بەڵام بۆ ئەمەش، جگە لە گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتوون ڕێگایەکی دیکەیان نییە، واتە: گەڕانەوە بۆ کەناری زەریا. باشە، ئاخر ئەمە چۆن دەبێت؟

خۆ ناتوانن بە هێلکەیەکی گەورەوە کە لەسەر پێکانی وەستاوە بگەڕێنەوە. گریمان توانییان بڕۆن، خۆ هەر ناگونجێت هێلکەکەیان لە کەنارێکدا دابنێن و بۆ ڕاوکردن بچنە ئاوەکەوە. ئەگەر وا بێت تەنیا یەک ئەگەر دەمێنێتەوە، هێلکەکە جێ بهێڵن و بڕۆن! باشە ئەی لای کێ جێی بهێڵن؟ بەپێی ئەوەی نابێت هێلکەکە لەسەر سەهۆڵەکە جێ بهێڵرێت، بەدڵنیاییەوە دەبێت لای پەنگوینە باوکەکە دابنرێت!

پەنگوینە دایک و باوکەکان، پێشتر چەند جارێک پرۆڤەیان لەسەر ئەم کارە کردووە، چونکە گواستنەوە و ڕادەستکردنی هێلکەکە بەسەلامەتی لە دایکەکەوە بۆ باوکەکە ئەوەندە کارێکی ئاسان نییە.

سەرەڕای هەموو پەرۆشی و گرنگیدانی پەنگوینە دایک و باوکەکە بە هێلکەکەیان، هەندێک جار هێلکەکە خل دەبێتەوە و

لە دەستیان دەردەچێت، بەمەش لە ماوەیەکی کەمدا دەیبەستێت و لەناو دەچێت.

لە دۆخێکی نەخوازراوی لەم شێوەیەدا، پەنگوینە دایک و باوکەکە دەڵێن: "چی بکەین، تازە ئەم ساڵ نەبووە نسیب. پشتیوان بە خودا بۆ ساڵێکی دیکە!" ئینجا بەرەو کەناری زەریاکە دەگەڕێنەوە. لەبەر ئەوەی ئیدی هۆکارێک نەماوە ئەو سەرقاڵی و برسێتیە بچێژن.

## ماڵئاوایی!

پەنگوینە دایکەکان کە هێلکەکان بەسەلامەتی بە باوکەکان دەسپێرن، بۆ دوایین جار ماڵئاوایی لە هاوسەرەکانیان دەکەن و سەرلەنوێ بە گەشتێکی دوور و درێژ و زۆر سەخت ڕێگای کەناری زەریا دەگرنەبەر، کە تاکە شوێنە بتوانن تیایدا سکیان تێر بکەن. ئێستا زستان سەختتر بووە و ڕەشەبا توند بووە. پەنگوینە دایکەکانیش برسی و ماندوون. بەڵام پێویستە دەیان کیلۆمەتر ڕێ ببڕن بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ کەناراوەکە و بگەن بە ئاوی زەریاکان.

پەنگوینە باوکەکان کە لای هێلکەکان ماونەتەوە، ئەرکێکی زۆر زۆر سەخت چاوەڕوانیانە، چونکە لە سەختترین کاتی

زستاندا هێلکەکان لەسەر پێکانیان ڕادەگرن بۆ ئەوەی بهێڵن بکەون، باش ئاگاداری کۆرپەکەی دەبێت تا لە هێلکەکە دێتە دەر، دوای ئەوەشی دێتە دەرەوە وەک چاوی دەیپارێزێت.

هەموو پەنگوینە باوکەکان شانبەشانی یەکتر بە شێوەی بازنەیەکی فراوان ڕادەوەستن و بەرگەی زریانەکانی زستانی ئانتارکتیکا دەگرن، کە هیچ گیاندارێکی دیکە وا بەئاسانی بەرگەی ناگرێت. لەو پەناگە گەورەیەدا، ئەوانەیان کە کەوتوونەتە دەرەوەی بازنەکە لەگەڵ ئەوانەی ناوەوە شوێن دەگۆڕنەوە، بەوەیش هیچ کامێکیان بەبەردەوامی لە دەرەوەی بازنەکە نابێت و ڕەق نابێتەوە.

ئەمە هاودەنگییەکی پاک و فیداکارییەکی بێوێنەیە و مرۆڤەکان کە تەنانەت لە کورترین ڕیزیشدا هەوڵ دەدەن بە فێڵ و تەڵەکە بچنە پێشەوە و ڕیزەکە تێکبدەن و نۆرەبڕی دەکەن، لێی تێناگەن.

لە پاش دوو مانگ و لە ناوەڕاستی مانگی تەمووزدا، لە یەکەم هێلکەوە یەکەم کرتە و دواتر دەنگی نزمی پەنگوینە کۆرپەکان دەبیسترێت.

بێچووەکانیش هەروەک هێلکەکان، پێویستە بەوریاییەوە بپارێزرێن و نابێت بخرێنە سەر سەهۆڵەکە. ئەگینا لە چاوتروکانێکدا لە سەرمادا دەیبەستن و ڕەق دەبنەوە.




پەنگوینە باوکە ئارامگرەکان کە ماوەی چەنـد مـانگێکە تـاکە پـاروویەکیش نەچـووەتە دەمیـانەوە و لە برسـاندا تەواو مانـدوو بـــوون، لە یەکەم ڕۆژی هاتنیـــان لە کەناراوەکـــانی زەریـــاوە خۆراکێکیـان لە دەمیانـدا هەڵگرتـووە کە سـەرەڕای ئەو هەمـوو برسـێتییە قووتیـان نەداوە، دەریـدەهێننەوە و دەیـکەن بە دەمـی بێچووەکانیانەوە کە وەک شـیر وایە. بێچـووەکە چەنـد ڕۆژێـک بەمە بەرگە دەگرێت.

پـێش ئەوەی باوکەکـان تاقەتیـان بچێـت، بێچووەکـانیش لە برساندا دەست بە گریان بکەن، لە دوورەوە دەنگی غەڵبەغەڵبـی کاروانی پەنگوینە دایکەکان دەبیسترێت.

پەنگوینە باوکەکان بە هاوار هـاوار و غەڵبەغەڵـب پێشـوازی لە کـــاروانەکە دەکەن کە بە گەدە و چیکڵـــدانەی پـــڕ و هێـــزی

جارانەوە گەڕاونەتەوە و تـامەزرۆی بینینـی بێچـوو و هاوسـەرە ئارامگرەکانیان گرتوونی.

لەم جەنجاڵی و دەنگەدەنگ و هاوارهاوارەدا، هەر یەکێکیان هاوسـەری خـۆی دەناسـێتەوە و دەیـدۆزێتەوە. ئێسـتا نـۆرەی باوکەکانە دەست بە گەشـت بـکەن. باوکەکـان هەر کە بێچـووە خۆشەویسـتەکانیان بەوریـاییەوە ڕادەسـتی دایکەکـان کـرد، بە کاروان دەست بە گەشتەکەیان دەکەن.

بەو شێوەیەش دایکەکان جارێکی دیکە فریـای باوکەکـان و بێچووەکانیش دەکەون!

دایکان هەمیشە فریادڕەسن...

بەو دڵانەی کە نـاوە پیرۆزەکـانی ڕەحـمان و ڕەحیمـی پەروەردگـار وەک ئەڵماسـێکی درەوشـاوە تیایانـدا ڕەنـگ دەداتەوە، ئەم چیـرۆکە گەرمە کە لە توانایـدایە بەسـتەڵەکەکانی ئانتارکتیکـا بتـوێنێتەوە، لەوەتەی زەوی بەدیهـاتووە هەر هەیە و ڕوو دەدات.



تـا کتێبێکـی دیـکەی زنجیـرەی بەدیهێـنراوە سەرسـوڕهێنەرەکان بە نیـازی دیدار.

# تاریق ئوسلو



نـاوی ڕاسـتەقینەی ئۆزکـان ئـۆزە-یە، لە سـاڵی ١٩٧٤، لە ساکاریا لەدایک بووە. نووسەر لە کۆتایی قۆناغی هەرزەکاریـدا لە گۆڤاری زافەر دەسـتی بە کـاری نووسـین کـردووە، لە پـاش قۆناغی ئامادەیی لە خوێنـدن بەردەوام نەبـووە. مـاوەیەک وەک بەڕێـوەبەری کاروبـاری نووسـینی گۆڤـارەکە کـاری کـردووە. ماوەیەکیش وەک سەرنووسـەری دەزگاکـانی ئوغوربـۆجێغی و زافەر یاینلاری کاری کردووە. هەم بە نـاوی خـۆی، هەمـیش بە ناوی تارق ئۆسلۆ-ەوە زۆر کتێبی بڵاو کـراوەتەوە، کە لەو کتێبـە زانسـتیە گشـتیانەی بـۆ منـداڵانی نووسـیوە، بەکاریهێنـاوە. زنجیـرەی (وەڵامـی پرسـیارەکانی منـداڵی)، کە خـوێنەرانی گەیشـتووەتە هەزاران منـداڵ؛ وەرگێـڕدراوەتە سـەر زمانەکـانی ئینگلیزی، ئەڵمانی، فەڕەنسی، هۆڵەندی، ئیندۆنیزی و کـوردی. نووسـەر کە بـێ دابـڕان لەسـەر کارەکـانی نووسـین بەردەوامە، هاوسەرگیری کردووە و باوکی دوو منداڵە.

# پێرست